کورد لە سەرچاوە مێژووییەکاندا

# کورد و کوردستان

## لە بەڵگەنامە و سەرچاوە مێژوویەکاندا

پ.ی.د. سەعدی عوسمان هەروتی



١

# کورد و کوردستان

## لە بەڵگەنامە و سەرچاوە مێژووییەکاندا

**(سەردەمی نوێ وهاوچەرخ)**

**پ. ی.د.سەعدی عوسمان هەروتی**

**کۆلێژی ئەدەبیات/ زانکۆی سەلاحەدین– هەولێر**

**سەرپەرشتیاری پڕۆژە**

**رابیعە فەتاح شێخ محەمەد**




**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**




**کۆمەڵەی ڕۆشنبیری مێژوویی کوردستان**

- **کورد و کوردستان لەبەڵگەنامە و سەرچاوە مێژووییەکاندا (١)**
- **نووسینی: پ. ی.د.سەعدی عوسمان هەروتی**
- **سەرپەرشتیاری پرۆژە:** رابیعە فەتاح شێخ محەمەد
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** هۆگر سدیق
- **نرخ:** ٤٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم** ٢٠١٤
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانە:** موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(١٢٩)ی ساڵی (٢٠١٤) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٨٠٨)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# نـــاوەڕۆك

## گوتەی بەرایی:

کورد وەکو نەتەوەیەکی دێرین وکوردستان وەکو وولاتێکی گرنگی ناو جەرگەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، لەسەردەمانێکی زووەوە ناویان لەتۆمارەکانی مێژوو نەخشێنراوە. بەهەمان شێوە لەسەردەمانی نوێ وهاوچەرخیشدا، سەدان وبگرە هەزاران بەڵگەنامەو سەرچاوەی مێژوویی باس لەکورد وکوردستان یان بەشێك وناوچەیەکی ئەم وولاتە وگروپێکی ئەم نەتەوەیە دەکەن. ئەم کۆمەڵە باسەی لەدوو توێی ئەم کتێبەدا بلاّودەکرێنەوە، چەند دەنکێکن لەخەرمانی ئەو بەڵگەنامەو سەرچاوە مێژووییانەی کە لەسەردەمی نوێدا ناوی کورد وکوردستانیان تێدا هاتووە.

لەم چەند ساڵەی ڕابردوودا کاتێ ئەم باس و توێژینەوانەم نووسی ئامانجی بنەڕەتیم ئەوەبوو کە پێگەی کوردو کوردستان لەمێژوودا دیاری بکەم وخوێنەرانیش بەسەرچاوەکانی مێژووی ئەم وولاّت و نەتەوەیە زیاتر ئاشنا بکەم. بۆیە هەموو ئەم باسانە لەکاتی خۆیاندا لەگۆڤارەکاندا بلاّوکراونەتەوە. هەندێ لەم گۆڤارانە گۆڤاری ئەکادیمین، چونکە هەندێ لەباسەکانیش لەبنەڕەتدا توێژینەوەی ئەکادیمی بوون.

لەبەرئەوەی هەریەك لەم باسانە پێشەکی خۆیان هەیە، بۆیە پێویست ناکات لێرەدا درێژەی بدەینێ وپێشەکییەکی تر بنووسین. بەلاّم تەنیا دەمەوێ چەند خاڵێك بخەمەڕوو: یەکەمیان ئەوەیە کە دەستکارییەکی زۆری هەندێ لەم باسانەم کردووە، بەتایبەتی باسی (کوردو مێژوونووسین لەسەردەمی نوێدا) کە (١٣) ساڵ بەسەر نووسین وبلاّوکردنەوەیدا تێپەڕیوەو هەندێ لەزانیارییەکانی پێویستیان بەپێداچوونەوەو زیادکردن هەبوو. دووەمیان: یەکێ لەتوێژینەوەکان خۆم لەبنەڕەتدا بەعەرەبی نووسیومەو بلاّوم کردۆتەوە. لەبەرئەوەی دەرفەتیشم نەبوو بیکەمە کوردی، بۆیە لەلایەن دەزگای (موکریانی) یەوە کراوەتە کوردی و ئینجا خۆم پێداچوونەوەی تەواوم بۆ کردووەو هەڵەکانم چاکردووەو دەربڕین وداڕشتنەکەیم گۆڕیوە، بەجۆرێك کەهێناومەتە سەر شێوازی نووسینی خۆم. سێیەمیان: بەپێچەوانەی ئەمە، یەکێ لەباسەکان (گەشتی دکتۆر ئیڤز بەکوردستاندا)

من نەمنووسیوەو کاتی خۆی بەعەرەبی لەلایەن نووسەرو وەرگێڕی بەتوانای عیراقی (جەعفەر خەیات) نووسراوەو بلاْوکراوەتەوە، بەلاْم من وەرمگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و سەرنج و پەراوێزم بۆ زیادکردووە. ئنجا لەیەکێ لەگۆڤارەکان سەرلەنوێ بلاْومکردۆتەوە. بۆیە پێم باش بوو لێرەش لەگەڵ ئەم باس و توێژینەوانەدا بلاْوی بکەمەوە. چوارەم: لەبەرئەوەی هەریەك لەم باسانە پێشتر بەجیا بلاْوبۆتەوەو زۆربەیان لیستی سەرچاوەی خۆیان هەیە، بۆیە بەپێویستم نەزانی بۆ هەموو کتێبەکە یەك لیستێکی سەرچاوە دابنێم.

لەکۆتاییدا ئەوە ماوە بڵێم کەبێگومان کتێب زیاتر دەکەوێتە بەر دیدی خوێنەران و لەهەمان کاتیشدا هۆکارێکە بۆ کۆکردنەوەی باس وتوێژینەوە پەرش وبلاْوەکان و پاراستنیان لەوونبوون و پەرتەوازەبوون. هەربۆیە پێم باش بوو ئەم کۆمەڵە باس وتوێژینەوەیە لەدوو توێی یەك کتێبەدا بلاْوبکەمەوە. بەو هیوایەی خوێنەران وهەروەها توێژەرانیش سوودی لێ ببینن.

د.سەعدی هەروتی
هەولێر ٢٦-١١-٢٠١١

## (باسی یەکەم)

## ساڵنامەکانی عوسمانی و دوو زانیاری مێژوویی گرنگی تایبەت بەکورد*

### پێشەکی:

هەرچەندە لەم (١٠) ساڵەی ڕابردوودا چەندین نامەی زانکۆیی وکتێب وباس و ووتار لەبارەی مێژووی کوردەوە نووسران، بەڵام دەشێ هێشتا بگوترێ کە لایەنێکی زۆری ئەم مێژووە بەتاریکی ماوەتەوە و سەبارەت بە هەندێ لایەنی تریش تەنیا زانیاری سەرپێییمان هەیە و بۆ بەڕاست زانینیان پێویستمان بە بەڵگەنامەی فەرمی و سەرچاوەی مێژوویی ڕەسەن هەیە. بێگومان ئەمە بۆ هەموو قۆناغەکانی مێژووی کورد ڕاستە، بەتایبەتی مێژووی نوێ (١٥١٤-١٩١٤). چونکە کەمێکی نووسەران و توێژەران خۆیان لەقەرەی ئەم ماوە مێژووییە دەدەن، بەهۆی گران دەستکەوتنی سەرچاوەی ڕەسەن و بەڵگەنامەی پێویست. ئەگەر دەستیش بکەون ئەوا بەزمانی جیاجیا نووسراون بەتایبەتی فارسی و تورکی عوسمانی، کە بێگومان بەکارهێنانیان کارێکی ئاسان نیە.

بەڵام ئەگەر دەرفەت بڕەخسێ کتێبخانەکانی موسڵ وبەغدا وهەروەها تورکیا وئێران بەسەربکرێنەوە، ئەوا دڵنیام زانیاری دەگمەن وبەڵگەنامەی مێژوویی گرنگمان دەست دەکەوێ، کە لاپەڕەکانی مێژووی کوردستان ڕووناك دەکەنەوە. ئەم دوو زانیارییەی کە لەم ووتارەدا دەمەوێ بیانخەمەڕوو، بەم شێوەیە بەدەست هێنراون. ئەوەبوو زستانی ساڵی ٢٠٠٠ کە خەریکی کۆکردنەوەی سەرچاوە بووم بۆ تێزی دکتۆراکەم، بەشێوازێك لەشێوازە مەترسیدارەکان خۆم گەیاندە شاری بەغدا. لەوێ لەکتێبخانەی شێخ عەبدولقادر گەیلانی چەند دەستنووس وسەرچاوەی ڕەسەنم دەستکەوت. لەنێویاندا دوو ساڵنامەی عوسمانی تێدابوو کە دوو زانیاری گرنگی تایبەت بەمێژووی کوردیان لەنێو

---

* ئەم نووسینە باسێکە لەژمارە (١٣١)ی گۆڤاری (مەتین) لەکانونی یەکەمی ٢٠٠٢ بڵاوبۆوە، ئەم گۆڤارە لەلایەن دەزگای (خانی) لەدهۆك دەردەچوو.

دوو تــوێی خۆیانــدا حەشــاردابوو.پێم باشــە پــێش ئــەوەی زانیارییــەکان بخەمــەڕوو، پێشەکییەك لەبارەی ساڵنامە بدەمە خوێنەر:

ساڵنامە زاراوەیەکی لێکدراوی عوسمانییە کـە لـەدوو ووشـە پێکهـاتووە: ئـەوانیش (ساڵ) و(نامە)ن کە لەزمانی کوردیشدا هەمان واتا دەبەخشــن. واتــا زاراوەکــە پێکــڕا دەبێتە (نامەی ساڵانە). هەروەها ڕاپــۆرت وهەڵســەنگاندنی ســاڵانەش دەبــێ، چــونکە هەندێ جار زاراوەی (سال تقویم) یش بەکاردەهات. دەولەتی عوسمانی لەسـاڵی ١٨٤٧ز یەکەم ساڵنامەی دەرکـرد، دواتــر ویلایەتــەکانی دەولــەتیش لەســەر هــەمان ڕێوشــوێن ڕاپۆرتی ساڵانەی خۆیان دەرکرد. کە زانیاری کارگێڕی وئابوری وئاوەدانکــاری وجــوگرافی ومێــژوویی گرنگــی لەمــەڕ ویلایەتەکــە بــەخۆوەدەگرت. هــەروەها دواتــر ســاڵنامەکان جۆراوجۆر بوون و تەنانەت ساڵنامە هەبوو کە تەنیا بۆ هونەر دەردەکرا.[1]

**زانیاری یەکەم:**

سەرەتاکانی پەیدابوونی قوتابخانەی فەرمی هاوچەرخ لەکوردستاندا:-

دەولــەتی عوســمـانی لەچوارچــێوەی هەوڵــە چاکســازییەکانیدا و بــۆ نۆژەنکردنــەوەی دامەزراوەکانی، لەساڵی ١٢٥٤ك/ ١٨٣٧-١٨٣٨ز قوتابخانــەی ڕوشــدییەی لەدەولەتــدا دامەزراند. کە یەکەم جار لەئەستانبۆلی پایتەختــدا بــوو.[2] شــایانی باســە لەدەولــەتی عوسمانی بەقۆناغی خوێندنی دوای سەرەتایی دەگوترا (روشدییە)،کە بێگومان لەووشەی (الرشد) ی عەرەبی هاتووە کە واتای (ژیری) دەبەخشێ و مەبەستیان تەمەنی ژیرییە.

بەڵام ئەم هەنگاوە لەهەرێم و ویلایەتەکانــدا زۆر دواکــەوت. ئــەوەتا لەویلایــەتێکی گرنگی وەکو بەغدا لەساڵی ١٢٨٦ك/ ١٨٦٩ز یەکــەم قوتابخانــەی ڕوشــدییە کرایــەوە. ئەویش بەهــەوڵی والییــەکی دڵســۆز وچاکســازیخوازی وەکــو (مدحــەت پاشــا ١٨٦٩-

(١) علي شاكر علي، ولاية الموصل في القرن السادس عشر، اطروحة دكتوراه، كلية الآداب، جامعة الموصل ١٩٩٢، ص٦٨.

(٢) عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، شركة التجارة والطباعة المحدودة، بغداد ١٩٥٥، مج ٧، ص٤١.

۱۸۷۲ز) بوو.[1] دیاره لەکوردستانی باشوریش (کوردستانی عیراقی ئێستا) هەر لەو سەروبەندەدا چەند مەکتەبێکی ڕوشدی کرانەوە.

ساڵنامەی دەولەتی عوسمانی ساڵی ۱۲۹۰ك/ ۱۸۷۲-۱۸۷۳ز کە قوتابخانە ڕوشدییەکان و هەروەها ژمارەی قوتابییەکانی ئەو قوتابخانانە لەویلایەتەکانی سەربەدەولەت دەژمێرێ، لەلیستەکەدا ناوی چەند شارێکی کوردیش دەهێنێ کە قوتابخانەی ڕوشدییەیان تێدابوو. ئەویش بەم شێوەی خوارەوە بوو[2]:

| ناوی قوتابخانە | ژمارەی قوتابیان |
|---|---|
| مەندەلی | ۱۸ |
| ئەربیل | ۳۹ |
| عەقرە | ۳۵ |
| کەرکوك | ۲۵ |
| سلیمانیە | ۳۸ |
| ڕەواندوز | ۳۰ |

ئەگەر ژمارەی قوتابیانی ئەو شارە کوردیانە بەراوورد بکەین لەگەڵ ژمارەی قوتابیانی شارو ناوچە عەرەبنشینەکانی عیراق، بۆمان بەدیاردەکەوێ کە ڕێژەی خوێندەواری وئاستی فێرخوازی لەکوردستاندا لەو ماوە مێژووییەدا لەئاستێکی خراپدا نەبووە. چونکە ئەگەر ژمارەی قوتابیانی قوتابخانەی (بەغدادی یەکەم) ی لێدەرکەین کە (۷٦) قوتابی بوو، دەبینین ژمارەی قوتابیانی شارەکانی تر جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ شارە کوردیەکاندا نەبوو.[3] هەروەکو لەم لیستەی خوارەوە بۆمان بەدیاردەکەوێ[1]:

(۱) جریدة الزوراء، عدد (۱۵) ۱۵ جمادي الآخرة ۱۲۸٦هـ، بەوەرگرتن لە: عباس العزاوي، المصدر السابق، ص۲۰٦.

(۲) سالنامه دولت علیه عثمانیة لسنة ۱۲۹۰، ص۲۱۱-۲۱۲.

(۳) کاتی خۆی کە ئەم ووتارە لەگۆڤاری مەتین بلاوکرایەوە لێرەدا لەتایپکردنەکە هەندێ هەڵەی تێداکرابوو، ئەم چەند دێرە وانووسرابوون کە ئەم هەڵێنجانەی ئێرە پێچەوانە ببۆوە.

| ژمارەی قوتابیان | ناوی قوتابخانە |
|---|---|
| ٤٤ | بەسرای دووەم |
| ٤٧ | موسڵ |
| ٤١ | حیللە |
| ٢٥ | خوراسان (بەعقوبە) |
| ٢٠ | مونتەفیك |
| ٢٥ | کوت ئەلعیمارە |
| ٣٥ | زوبێر |
| ٢٠ | سامەڕا |
| ٣٠ | عیمارە |
| ٢٠ | کەربەلا |

**زانیاری دووەم:**

**مەدالیای کوردستان:**

بلەج شێرکۆ لەکتێبی (کێشەی مێژینەو ئێستای کورد) باسی ئەوە دەکا کە هێزەکانی عوسمانی دوای ئەوەی لەساڵی ١٨٤٧ز دا ڕاپەڕینی بەدرخان پاشای بۆتانیان دامرکاندەوە، دەولەت مەدالیایەکی بۆ بیرەوەری ئەم سەرکەوتنە دروستکرد و ناوی لێنا (مەدالیای جەنگی کوردستان) کە ڕوویەکی لێی نووسرابوو "مەدالیای کوردستان"

---

(١) سالنامە دولت علیە عثمانیة لسنة ١٢٩٠، ص٢١١-٢١٢.

ڕووەکەی تریشی وێنەی قەڵای (ئارۆخ)ی لەسەر هەڵکەندرابوو، کە بەدرخان پاشا دواجار خۆی لەوێ قایمکردبوو.[1]

دروستکردنی ئەم مەدالیایـە لەلایـەن دەوڵەتـەوە نیشـانەیەکی ئاشـکرایە لەسـەر بایەخی ئەو سەرکەوتنەی کە بەدەسـتیان هێنـا. ئەمـەش ڕاستەوڕاسـت بەڵگـەی ئـەوە بەدەستەوە دەدا کە ڕاپەڕینەکەی بەدرخان پاشا تاڕاددەیەکی وا فراوان ببوو کـە زەنگـی مەترسی بۆ دەوڵەت لێبدات. سـەرەڕای بـەرزی بـەهای ئـەو ڕاسـتییە، کەچـی هێشـتا نەماندەتوانی مەسەلەی ئەم مەدالیایە بەدڵنیاییەوە وەربگرین. چونکە نموونـە و وێنـەی ئەم مەدالیایەمان بەرچاو نەکەوتبوو. هەروەها سەرچاوەی سەرەکیمان بۆ ئـەم زانیارییـە هەر تەنیا کتێبەکەی بلەج شێرکۆ بوو. کەئەویش بـۆ داکـۆکی کـردن لەکێشـەی کـورد نووسرابوو، واتە ڕێی ئەوەی تێدەچوو کە بۆ گەورەکردنی ڕاپەڕینەکـە ئـەم مەسـەلەیەی دروستکردبێت.

بەڵام خۆشبەختانە ئێستا دەتوانین ڕاستی هەبوونی ئەم مەدالیایە بسەلمێنین. ئـەوەتا لەساڵنامەیەکی ویلایەتی بەغدا ،کە بەناونیشانی "سال تقویم" ـەو بەروارەکەی لەسـەر نەماوە بەڵام واپێدەچێ دوای ساڵی ١٣٢٥ك/ ١٩٠٦-١٩٠٧ز نووسـرابێت، لـە لاپـەڕە ٦٧٩ لەلیستی ئەو مەدالیایانـەی کـە حکومـەت دروسـتی کـردوون نـاوی (کردسـتان مدالیەسـی- واتـە: مـەدالیای کوردسـتان) دێـت. لەبەرامبەریشـی نووسـراوە کـە مەدالیایەکی زیوەو لەساڵی ١٢٦٣ك/ ١٨٤٨ز لەسەردەمی سەڵتەنەتی عەبدولحەمیـدی یەکەم (١٨٣٩-١٨٦١ز) داندراوە.

---

(١) بڕوانە چاپی سێیەمی ئەم کتێبە، بێ شوێنی چاپ، ١٩٩٢، ل٤٣.

## سەرچاوەکانی باسی یەکەم

- بلەج شێرکۆ، کێشەی مێژینەو ئێستای کورد، چاپی سێیەم، بێ شوێنی چاپ، ١٩٩٢.

- سالنامه دولت عليه عثمانية لسنة ١٢٩٠.

- عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، مج ٧، شركة التجارة والطباعة المحدودة، بغداد ١٩٥٥.

- علي شاكر علي، ولاية الموصل في القرن السادس عشر، اطروحة دكتوراه، كلية الآداب، جامعة الموصل ١٩٩٢.

## کوردستان و هەندێ زانیاری کارگێڕی
## لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانی سەدەی شازدەهەمدا*

لەسەرەتاکانی سەدەی شازدەهەمدا کوردستان ڕووبەڕووی شالاوی هێزەکانی شا ئیسماعیلی سەفەوی (١٥٠١-١٥٢٤) بۆوە و لەئەنجامدا زۆربەی ناوچەکانی کوردستان بوونە بەشێك لەدەولەتی سەفەوی (١٥٠١-١٧٣٦)، کەدەولەتێکی شیعەی توندڕەو بوو دژایەتی قەوارەو میرنشینە خۆماڵییە کوردیەکانیشی دەکرد. بۆیە کورد چاوەڕێی دەرفەتێك بوو بۆ ڕزگار بوون لەم ڕەوشە دژوارە. زۆری نەبرد ئەم دەرفەتە هاتەئاراوە کاتێك سەلتان سەلیمی یەکەمی عوسمانی (١٥١٢-١٥٢٠) کەوتە ململانێ لەگەڵ شا ئیسماعیلی سەفەوی و لەشەڕی (چالدێران) ی ساڵی ١٥١٤ بەسەریدا سەرکەوت. میر و سەردارانی کورد ئەم هەلەیان قۆستەوەو کەوتنە بەدەرنانی پاشماوەی هێزەکانی سەفەوی لەزۆربەی شارو قەڵاکانی کوردستان. لەم کردارەشدا هێزەکانی عوسمانی یارمەتی کوردیاندا، چونکە میرو سەردارانی کورد بەهەوڵ و کۆششی مەلا ئیدریسی بەدلیسی ڕێکەوتننامەیەکیان لەگەڵ دەولەتی عوسمانی بەستبوو. ئیتر لەئەنجامی شەڕی چالدێران و ڕووداوەکانی ساڵانی ١٥١٤-١٥١٦دا ناوچەکانی ناوەڕاست و ڕۆژئاواو بەشێکی گرنگی باکورو باشوری کوردستان هاتنە نێو بازنەی دەسەڵاتی عوسمانی. دواتریش لەسەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونی (١٥٢٠-١٥٦٦) لەئەنجامی هەڵمەتەکانی ساڵانی ١٥٣٤ و ١٥٤٨دا، هەرێمەکانی (وان) و (شارەزوور) و (ئەرزەڕۆم)یش هاتنە پاڵ ئەو بەشەی کوردستان کە سەربەدەولەتی عوسمانی بوو. کاتێکیش هەردوو دەولەتی عوسمانی و سەفەوی لەساڵی ١٥٥٥دا پەیماننامەی (ئاماسیە) یان مۆرکرد و هەردوولا دانیان بەدەسەڵاتی یەکترنا لەسەر ئەوناوچانەی کەداگیریان کردبوو، ئەم بەشەی کوردستان بەشێوەیەکی فەرمی و بۆ هەمیشەیی بەدەسەڵاتی

---

* ئەم باسە لە ژمارە (٧)ی گۆڤاری k21 دا بڵاوکراوەتەوە کە لەساڵی ٢٠١٠ دەرچووە.

عوسمانییەوە گرێدرا.[1] لەئەنجامی ئەمەدا کوردستان لەپاڵ ناوچەکانی تری ئیمپراتۆریای عوسمانی لەبەڵگەنامەکانی ئەو سەردەمەدا ناوی هاتووە.

یەکێك لەو بەڵگەنامانە ئەوەیە کەلێرەدا دەیخەینەڕوو، ئەویش دانە ڕەسەنەکەی لەئەرشیفی ناوەندی بەڵگەنامە مێژووییەکانی (وارشۆ)ی پایتەختی پۆڵەندا پارێزراوە، بەڵام ئێمە وێنەکەیمان لەم کتێبەدا دەستکەوت: ( Zdzistaw Zygulski jr.- Odsiecs Wiedenska 1683) کە لەساڵی ١٩٨٨ لەلایەن دەزگای بڵاوکردنەوەی ( Krajwa Agencja Wydawicza) لەشاری (کراکۆف) ی پۆڵەندا بڵاوکراوەتەوە. کتێبەکە بەهەردوو زمانی پۆڵەندی و ئینگلیزییەو پێشەکییەك لەخۆدەگرێ لەگەڵ چەندین وێنەو نەخشەی مێژوویی کەبەشێکی زۆریان هی دەولەتی عوسمانین.

لەکتێبەکەدا ئەم بەڵگەنامەیە بەهەڵە کراوەتە هی سەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونی(١٥٢٠-١٥٦٦) و ساڵی (١٥٢٥) ی بۆ داندراوە. خۆشی لەڕاستیدا دەگەڕێتەوە بۆ چارەکی کۆتایی سەدەی شازدە، چونکە لەکۆتایی بەڵگەنامەکە ئاماژە بەناوی سوڵتان موڕادی کوڕی سوڵتان سەلیم کراوە، ئاشکرایە ئەمە سوڵتان موڕادی سێیەمی عوسمانییە (١٥٧٤-١٥٩٥) کەدوای سوڵتان سەلیمی دووەمی(١٥٦٦-١٥٧٤) باوکی هاتەسەر تەختی سەڵتەنەت. هەروەها لەبەڵگەنامەکەدا ناوی دورگەی (قوبرس) هاتووە وەك ناوچەیەکی ژێردەسەڵاتی عوسمانی، خۆدیارە ئەم دورگەیە لەساڵی ١٥٧١دا لەلایەن عوسمانیەکانەوە داگیرکرا.[2]

بەڵگەنامەکە کەلەبنەڕەتدا نامەیەکی سوڵتانی عوسمانییە بۆ دەسەڵاتدارێکی ئەوروپی بەستایشی خوداو پەسنی پێغەمبەرو چوار یارانی دەست پێدەکات بەم شێوەیە: "بەچاودێری بێ غایەتی حەزرەتی ڕەببی عیززەت پیرۆزبێ تواناکانی و بەرزبێ ناوی، بەموعجیزە پڕبەرەکەتەکانی مۆری تەواوکەری پێغەمبەرایەتی وئەستێرەی کەلوی لاوچاکی و پێشەوای

(١) بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: د.سعدي عثمان هروتي، كوردستان والامبراطورية العثمانية/ دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان، مؤسسة موكرياني للنشر- اربيل، مطبعة خاني، دهوك ٢٠٠٨، ص٣٠ ومابعدها.

(٢) لەبارەی داگیر کردنی دورگەی ڕۆدس بڕوانە: محمد فريد بك المحامي، تاريخ الدولة العلية العثمانية، تحقيق: د.احسان حقي ،ط١٠، دار النفائس، بيروت ٢٠٠٦، ص٢٥٥-٢٥٦.

کۆمەڵی پێغەمبەران نمونەی تیپی بژاردەکان شانازی هەردوو جیهان پێغەمبەر حەزرەتی موحەممەدی موستەفا درووددو سەلامی خوای بەرز و بێ هاوتای لەسەربێ، ئنجا بەپاڵپشتی پیرۆزیی گیانی هەرچوار یارانی رەزای خودای باڵادەستیان لەسەربێ هەموویان و هەموو پیاوچاکانی بەرێز و لەخواترسانی مەزن." دوای ئەمە (توغرا)ی سوڵتانی هەیە کە واژۆی فەرمی سوڵتان بوو بۆ مۆرگردنی بەڵگەنامە فەرمییەکان.

ئنجا دەڵێ: "من سوڵتانی سوڵتانەکانی زەمان، بەڵگەی خاقانەکانی سەردەم ، تاج بەخشی خوسرەوانی جیهان، سێبەری خودای پادشای مەننان. سوڵتان و پادشای شەرافەتمەندترین شارو ئاوەدانیەکان مەککەی پیرۆز و مەدینەی رۆشن، پیرۆزترین وڵات و مەملەکەت قودسی پیرۆز و شامی خانەی ئاشتی، میسر و یەمەن، سەنعا و عەدەن، دیاربەکر و کوردستان، ئەرزن رۆم (ئەرزەرۆم) و گورجستان، بەغدا و وان، حەلەب و هەموو عەرەبستان، ئەنادۆڵ و قەرەمان، زولقەدەر و دورگەی رۆدس، ویلایەتی رۆم و تەرابلوس، بەسرا و شەهرزول (شارەزوور)، وە حەسرەتی پاشایان ئەستانبولی پارێزراو ودورگەی قوبرس". هەروەها ئاماژە بە تونس و جەزائیریش دەکات. دێری دواتریش لەوێنەکەدا دەرنەچووە بەڵام دیارە باسی ویلایەت و ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی عوسمانی دەکا لە بەشی ئەوروپا. ئنجا نووسراوە :"حەزرەتی سوڵتان مورادخان کوڕی سوڵتان سەلیم خان کوڕی سوڵتان...". دەبێ دواتریش ناوەڕۆکی نامەکە دەست پێبکات بەڵام لەوێنەکەی بەردەستمان ئەمەیان دەرنەچووە، چونکە تەنیا وێنەی بەشی سەرەوەی بەڵگەنامەکە گیراوە.

دوای خستنەڕووی بەڵگەنامەکە دەتوانین ئەم سەرنجانە تۆمار بکەین:

١- ئەم هێزو توانایە زۆرەو سنووره فراوانەی قەڵەمڕەوی دەولەتی عوسمانی وایکردبوو سوڵتانەکانی عوسمانی زۆر بەشان و باڵی خۆیاندا هەڵبدەن و لافی ئەوە لێبدەن کە ئەوان سەرکردەی هەموو پادشایانی جیهانن و سێبەری خودانە لەسەر زەوی. لەهەموو نووسراوێکی فەرمیشدا بەتایبەتی بۆ دەسەڵاتدار و سەرۆکی وولاتانی تر بەشانازییەوە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان ئەژمار دەکرد و یەکە یەکە ناویان دەهێنان. ئەمە نەریتێك بوو هەموو سوڵتانەکانی ئەم سەردەمە لەسەری دەڕۆیشتن.[١]

(١) بۆ نمونە بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ص٢١٠.

٢- زۆربەی ئەو هەرێم و ناوچانەی لە بەڵگەنامەکەدا ناویان هاتووە ویلایەت بوون لەنێو ئیمپراتۆریای عوسمانیدا، وەکو: دیاربەکر، ئەرزەڕۆم، ئەنادۆڵ، قەرەمان، تەرابلوس، بەسرا.[1] تەنانەت زاراوەی (ولایت/ ویلایەت)یش لەبەڵگەنامەکەدا بەکارهاتووە نەك (ایالت/ ئیالەت) وەکو بینیمان. ئەمەش ئەم زانیاریە پشتڕاست دەکاتەوە کە دەڵێ تاساڵی ١٠٠٠ك/ ١٥٩١ز لەدەولەتی عوسمانیدا زاراوەی (ویلایەت) لەجیاتی (ئیالەت) بەکاردەهات.[2] شایانی باسە (ویلایەت) دواتریش (ئیالەت) گەورەترین یەکەی کارگێڕی بوو لە دەولەتی عوسمانیدا کە دابەش دەبوو بۆ چەند یەکەی بچووکتر ئنجا بچووکتر.

٣- بەتێبینی کردنی ناوی ناوچە یان ویلایەتەکان، لەنێو ناوچەکانی عیراقی ئێستا تەنیا (بەغدا) و (بەسرا) و (شارەزوور) دەبینین و ناوی (موسڵ) بەدی ناکەین، کە ئەویش لەسەردەمی عوسمانیدا یەکێك بوو لەویلایەتەکانی عیراقی ئێستا. ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کە لەم ماوەیەدا موسڵ مەڵبەندی ویلایەتێك نەبووە وەك لەسەرچاوەیەکی تریشدا ئاماژە بەوەکراوە کە لەماوەی نێوان ١٥٨١-١٦٠٥ ویلایەتێك بەناوی موسڵ لەئارادانەبووە.[3] ئەمە لەکاتێکدایە کە شارەزوور وەکو ویلایەتێك هەبوونی هەبووە . شایانی باسە ئەمەی دوایی بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە چونکە لەسەرەتادا مەڵبەندەکەی لەناوچەی شارەزووری ئێستا دابووە، کە سەردەمێك لە قەڵای زەڵم بوو دواتر گوازراوەتەوە بۆ گوڵعەنبەر کەنزیك خورماڵی ئێستا بوو، بەڵام لەکۆتایی سەدەی شازدەدا مەڵبەندەکەی گوازراوەتەوە بۆ شاری کەرکوك و ناوەکەشی هەروەکو پێشوو بە شارەزوور ماوەتەوە.[4]

٤- بەلای ئێمە لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە کە ناوی کوردستان لەبەڵگەنامەکەدا هاتووە، وە ئەگەر لەسەرنجەکانی پێشوو بگەینە ئەو دەرەنجامەی کە ئەم بەڵگەنامەیە دەگەڕێتەوە بۆ

---

(١) بڕوانە لیستی ناوی ویلایەتەکانی عوسمانی لە: د.خليل اينالجيك، تاريخ الدولة العثمانية من النشوء الى الانحدار، ت:د.محمد .م. الارناؤوط، دار المدار الاسلامي، ط١، بيروت ٢٠٠٢، ص١٦٧-١٦٨.

(٢) دائرة المعارف الاسلامية، مج٥، مادة ايالة، ص٢٦٤.

(٣) علي شاكر علي، ولاية الموصل في القرن السادس عشر/ دراسة في أوضاعها السياسية والادارية والاقتصادية، اطروحة دكتوراه، كلية الاداب جامعة الموصل/ ١٩٩٢،ص١٢٠.

(٤) د.سعدي عثمان حسين، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر/ دراسة في علاقاتها السياسية والادارية والاقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل، اربيل ٢٠٠٦،ص٩٥.

هەشتاكانی سەدەی شازدە، وە لەبەرئەوەی لەدەقی بەڵگەنامەیەكی تری عوسمانی ساڵی ١٥٢٥دا بەهەمان شێوە زاراوەی كوردستان دەبینین،[1] بۆیە دەتوانین بەدڵنیاییەوە بڵێین كە دەوڵەتی عوسمانی هەرلەسەرەتای سەدەی شازدەوە بەفەرمی ناوی (كوردستان)ی بەكارهێناوە.

هەرچەندە دیارە كەبەكارهێنانی ئەم ناوە لەڕووی كارگێڕییەوە بووە، بەڵام گومان لەوەدانیە كەڕەهەندی جوگرافی و نەتەوەییش لەبەرچاو گیراوە. چونكە یەكەمجار هەموو ئەو ناوچە و میرنشینە كوردییانەی كە لەسەردەمی سوڵتان سەلیمی یەكەمدا (١٥١٢-١٥٢٠) كەوتنە ناو قەڵەمڕەوی عوسمانی، ویلایەتێكیان لێ پێكهێنرا بەناوی ویلایەتی كوردستان. بەڵام لەبەرئەوەی ناوەندی ویلایەتەكە شاری دیاربەكر بوو ، بۆیە (ویلایەتی دیاربەكر)یشی پێدەگوترا. ئەوەتا لەتۆمارێكی عوسمانی ساڵی ١٥٢٠دا بەناوی (ویلایەتی دیاربەكر) نووسراوە.[2] بەڵام لەنێو لیستێكی ویلایەتە عوسمانیەكانی ساڵی ١٥٢٧دا هەردوو نێوی دیاربەكر و كوردستان دەبینین.[3] بەهەمان شێوە لەبەڵگەنامەكەی بەردەستیشمان هەردووكیان بەیەكەوە ناویان هاتووە. كەواتە لەسەرەتادا مەبەست لەم ناوە هەموو ئەو ناوچە كوردیانە بوو كە سەربە قەڵەمڕەوی عوسمانی بوون. بەڵام دواتر كە ناوچەی تری كوردستان داگیركرا، ئەم ناوچانە نەهاتنە ژێر ڕكێفی ئەم ناوەوە. بەڵكو هەر ناوچەیەكی گەورە ویلایەتێكی عوسمانی لێ پێكهێنرا و بەناوی مەڵبەندی ناوچەكەوە بانگكرا. بۆیە لەم بەڵكەنامە نێوبراوەدا لەپاڵ (دیاربەكر و كوردستان) ناوی سێ ناوچەی كوردی تر دەبینین، ئەوانیش بریتین لە:(وان) و (شارەزوور) و (ئەرزەڕۆم). ئەمانە ئەو ناوچە كوردیانە بوون كە لەسەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونی (١٥٢٠-١٥٦٦)دا داگیر كران، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا.

---

(١) محمد فريد بك المحامي، م . س، ص٢١٠.

(٢) دائرة المعارف الاسلامية، مج٥، مادة ايالة، ص٢٦٧.

(3) Colin Imber,The Ottoman Empire 1300-1650 \The Structure of Power ,1st pub. Palgrave Macmillan,2002,p.179.

## سەرچاوەکانی باسی دووەم

- د.خليل اينالجيك، تاريخ الدولة العثمانية من النشوء الى الانحدار، ت:د.محمد .م. الارناؤوط، دار المدار الاسلامي، ط١، بيروت ٢٠٠٢.

- دائرة المعارف الاسلامية، مج٥، مادة ايالة، خليل اينالجيك.

- د.سعدي عثمان هروتي، كوردستان والامبراطورية العثمانية/ دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان، مؤسسة موكرياني للنشر- اربيل، مطبعة خاني، دهوك ٢٠٠٨.

- د.سعدي عثمان حسين، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر/ دراسة في علاقاتها السياسية والادارية والاقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل، اربيل ٢٠٠٦.

- علي شاكر علي، ولاية الموصل في القرن السادس عشر/ دراسة في أوضاعها السياسية والادارية والاقتصادية، اطروحة دكتوراه، كلية الاداب جامعة الموصل/ ١٩٩٢.

- محمد فريد بك المحامي، تاريخ الدولة العلية العثمانية، تحقيق: د.احسان حقي، ط١٠، دار النفائس، بيروت ٢٠٠٦.

-Colin Imber,The Ottoman Empire 1300-1650 \The Structure of Power , 1st pub. Palgrave Macmillan, 2002,p.179.



سولتان سلێمانی قانونی (١٥٢٠-١٥٦٦)

## کورد ومێژوونووسین لەسەردەمی نوێدا ١٥٠٠-١٩٠٠ ز*

**دەروازە:**

یەکێك لەتایبەتمەندییەکانی بواری مێژوونووسین، بنەمای (پەرەسەندن) ـە. چونکە زانیارییە مێژووییەکان کە کەرەستەی سەرەکی ئەم نووسینەن، بەتێپەڕبوونی کات لەگۆڕان و زیادبوون دان. ئەوەی ئەمڕۆ نایزانین، سبەی دەزاندرێ. ئەوەی سەردەمێك بەنهێنی دادەنرێ، سەردەمی دواتر دەبێتە زانیارییەکی بەربلاو. ئەوەی دوێنێ بەڕاست دەزانرا، ئەمڕۆ دەبێتە هەڵەیەکی مێژوویی. لەبەرئەوە ئەو بڕیارەی کە مێژوونووس لەبارەی بابەتێکەوە دەیدات، مەرج نییە تاسەر کاریگەری هەبێت.

بۆ ئەوەی زۆر لەبابەتی سەرەکیمان دوور نەکەوینەوە، دەڵێین تا ئەو چەند ساڵەی دوایی (شەرەفنامە) بە یەکەم کتێبی مێژوویی سەربەخۆ دادەنرا، کە بۆ مێژووی کورد و کوردستان تەرخانکرابێت. (شەرەفخان)یش بەیەکەم کەس دادەنرا کە "تێکڕای بەرهەمی خۆی بۆ مێژووی کوردو کوردستان" تەرخان کردبێت، هەروەکو دکتۆر (کەمال مەزهەر) دەفەرموێت.[1] بەڵام زانیارییەکانی ئەمڕۆ بۆمان دەردەخەن کە ئەم حوکمە ئێستا چەندوچون هەڵدەگرێ، چونکە لەم چەند ساڵەی ڕابردوو بۆمان بەدیارکەوت کە پێش شەرەفنامە چەند سەرچاوەیەکی مێژووی تر هەن کەباسی چەند لایەنێکی مێژووی کورد یان بەشێکی مێژووی کوردستانیان کرووە. لێرەدا ناوی هەندێك لەم سەرچاوانە دەبەین کە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا نووسراون، لەوانە: کتێبی (القلاع والاکراد) کە لەلایەن (أبي

---

* ئەم باسە لەژمارە (٢٩) ی گۆڤاری (ڕامان) بڵاوکراوەتەوە، کە لە ١٩٩٨/١١/٥ لەهەولێر دەرچووە. بەڵام لەبەرئەوەی چەند ساڵێك بەسەر نووسین وبڵاوکردنەوەی ئەم باسەدا تێپەڕیوەو لەم ماوەیەدا چەندین پەرەسەندن ڕوویانداوە، لەئەنجامدا هەندێ لەزانیارییەکانی کۆن ببوون وهەندێکیشیان گۆڕانکارییان بەسەردا هاتبوو. بۆیە بەپێویستمان زانی لەزۆر شوێندا دەستکاری باسەکە بکەین و زانیاری نوێی بۆ زیاد بکەین.

(١) د.کەمال مەزهەر ئەحمەد، مێژوو، بەغدا ١٩٨٣، ل١٠٤.

الحسن علي بن محمد المدائني ٧٥٢-٨٣٩ز) دانـراوه كەخـەڵكی بەسـرا بـوو. هـەروەها كتێبی (انساب الاكراد) كەدانەرەكەی نووسەری فارسی بەناوبانگ (ابن قتيبة الدينوري- لەساڵی ٨٨٩ز مردووه)يە. دوای ئەمانە (ابن ابي الهيجاء الـروادي) كەمیرێكی كـوردە، كتێبی (تاريخ آذربيجان) ی داناوە كە باس لـە میرنشـینە كوردییـەكانی ئـەو ناوچـەیە دەكات لەسەدەكانی ناوەڕاستدا. دانراوی (تاريخ دولة الاكـراد)ی (محمد بـن ابـراهيم بـن ابوالفوارس عبدالعزيز الخزرجي) یش، یەكێكە لەم سەرچـاوانە. بێگومـان نـابێ (تـأريخ اربل)ی مێژوونووسی گەورە (ابن المستوفي)یش لەبیر بكەین.[1]

هەر لەنێو ئەم سەرچاوانەدا كتێبی (تأريخ ميافارقين وآمد)ی (ئیبنو ئەزرەقی فـارقی- لەسـاڵی ١١٧٥ز مـردووە) بایـەخێكی تایبـەتی هەیـە. هەرچـەندە ئـەم كتێبـە بـەپێی ناونیشانەكەی وادەردەكـەوێ كـە بـۆ مێـژووی هـەردوو شـاری (میافـارقین) و (ئامـەد/ دیاربەكر) تەرخانكرابێ، بەڵام بەشی سەرەكی زانیارییەكانی تایبەتـە بەمێـژووی هـەردوو میرنشینی (دۆستەكی) و (مەروانی). وەك سەرچاوەیەكی ڕەسـەنیش ئـەژمار دەكـرێ بـۆ مێژووی كوردسـتانی بـاكور لـەنیوەی دووەمـی سـەدەی چـوارەم و سـەرەتاكانی سـەدەی شەشەمی كۆچی (كۆتای سەدەی دەیەم تا سەرەتاكانی سەدەی دوازدەمی زایینی). ئـەوەی جێگەی دڵخۆشییە لەم ساڵانەی دواییی ئەم كتێبە لەلایەن هەردوو بەڕێز (د.قادر پشـدەری) و (د.ئاكۆ بورهان) وەرگێڕدرایە سەر زمانی كوردی و لەدەزگای وەرگێڕان بڵاوكرایەوە.[2]

لەكۆتاییـدا دەبێـت ئـەوەش بـاس بكـەین كەلەسـەدەكانی ناوەڕاسـتدا زۆر مێژوونووسی كوردمان هەن كـە نووسـراوی مێـژوویی گشـتییان دانـاوەو لابـەلا باسـی ڕووداوی تایبەت بە كوردیشـیان كـردووە. وەك: (أبوحنیفـة الـدینوري) دانـەری كتـێبی (الأخبـار الطـوال)، (ابـن الأثـیر) كـە بەدانراوەكـەی (الكامـل فی التـأریخ) ناوبـانگی دەركردووە، (ابن خلكان) كە بەخاوەنی (وفيات الأعيان) دەناسرێ.[3]

---

(١) بهزاد شرفخان، حول المصادر التأريخية المؤلفة خصيصاً لتأريخ الكور وكوردستان خلال العصور الوسطى، گۆڤاری (شانەدەر) ژمارە (٢) حوزەیران ١٩٩٧.

(٢) بڕوانە: ئیبنو ئەزرەقی فارقی، مێژووی میافارقین وئامەد، ساغكردنەوەی: د.بدوي عبداللطيف عوض، و: د.قادر محەمەد پشدەری و بورهان محەمەد، چاپخانەی منارە، هەولێر ٢٠٠٧.

(٣) كەمال مەزهەر، س. پ، ل١٠٠-١٠٣.

**یەکەم: مێژوونووسین لای کورد لەسەدەی شازدەمدا:**

هەر لەسەدەکانی ناوەڕاستەوە دیاردەیەك لای مێژوونووسان بەگشتی ومێژوونووسانی کورد بەتایبەتی بەرچاودەکەوێت. ئەویش ئەوەیە کە بایەخ بەمێژووی وولاتەکەیان نادەن، بەڵکو زیاتر مێژووی جیهانی ئیسلامی بەگشتی، یان هەر مێژووی گشتی دەنووسن. یان بەلای مێژووی ئەو میللەت و وولاتانەدا دەچن کە خاوەن دەولەت و دەسەلاتن. هەندێکیان لەژێر سایەی دەسەلاتداران ئەو کارەیان دەکرد. ئەوانە پێیان دەگوترا مێژوونووسی دەربار (مؤرخ البلاط). بێگومان بەرژەوەندی تایبەتی ولاوازی هەستی نەتەوایەتی لەوسەردەمە، هۆکاری سەرەکی ئەم دیاردەیە بوون. لەم جۆرەی دوایی دەتوانین ئاماژە بە نمونەیەکی دیار بکەین کە ئەویش (ئیدریسی بەدلیسی)[1] یە.

ئیدریس کوڕی حوسامەددین کوڕی عەلی کە بە (بەدلیسی) ناسرابوو لەبەرئەوەی کوردێکی خەڵکی بەدلیس بوو، کەسایەتیەکی مێژوویی دیاری سەرەتای سەدەی شازدەمە. ئەو نەك هەر لەمێژووی کوردستان بەڵکو لەمێژووی هەردوو دەولەتی سەفەوی وعوسمانیشدا ڕۆڵ وکاریگەری هەبوو. ناوبراو یەکێك بوو لەپیاوە نزیکەکانی سوڵتان بایەزیدی دووەمی عوسمانی (١٤٨١-١٥١٢). دوای ئەویش لای سوڵتان سەلیمی یەکەم (١٥١٢-١٥٢٠) زۆر پلەو پایەی فەرمی گرنگی وەرگرتووەو کاریگەرییەکی تەواوی بەسەر مێژووی کوردەوە هەبووە. بەتایبەتی بەو ڕۆڵە گرنگەی کە هەیبووە لەڕاکێشانی میر و سەرانی کورد بۆ لای سوڵتان سەلیم لەشەڕی چالدێران (١٥١٤) و دواتریش ڕێکخستنی ڕێکەوتننامەیەك لەنێوان میرە کوردەکان و سوڵتان سەلیم هەر لەو ساڵەدا. کە بەهۆیەوە پەیوەندی نێوانیان ڕێکخراو کوردەکان دەسەلاتی عوسمانییان قەبولکرد.[2]

جگە لەو رۆڵە مێژووییە گرنگە، ناوبراو دەستێکی ڕەنگینیشی هەبو لەبواری نووسینداو چەندین کتێب و نامیلکەی داناوە. بەڵام ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگە کتێبە

---

(١) لەبارەی ئەم کەسایەتییە بڕوانە: محمد بایراقدار، ئیدریسی بدلیسی، و: شکور مستەفا، چ١، کوردستان ١٩٩٩.

(٢) لەم بارەیەوە بروانە: د. سعدي عثمان هروتي، كوردستان والامبراطورية العثمانية/ دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان (١٥١٤-١٨٥١)، مؤسسة موكرياني- اربيل، مطبعة خاني، دهوك ٢٠٠٨، الفصل الثاني.

مێژووییەکانیتی کە لێرەدا بەکورتی باسیان دەکەین: ئیدریسی بەدلیسی بەفەرمانی سوڵتان بایەزیدی دووەم کتێبی (هشت بهشت)ی بەفارسی داناوە کە باسی مێژووی هەشت سوڵتانە یەکەمەکانی عوسمانی دەکات. ناوبراو ئەم کتێبەی لەساڵی ١٥٠٥ (یان ١٥١٢)[١] تەواوی کردووەو پێشکەشی سوڵتانی کردووە. کتێبەکە بەشێوازێکی ئەدەبییانە نووسراوەو لەشێوەی پەخشان دایە. بەڵام نزیکەی (٨٠٠) دێرە هۆنراوەو چوارینەشی تێدایە.بەدلیسی بۆ نووسینی ئەم مێژووە سوودی لەکتێبەکانی مێژوونووسانی پێش خۆی وەرگرتووە، بەتایبەتی مێژوونووسانی عوسمانی وەك (عاشق پاشازادە) و (نەشری). بەهەمان شێوە ئەم کتێبەش بووەتە سەرچاوە بۆ زۆر لەمێژوونووسانی دوای خۆی، وەك (سعدالدين خواجە- تاج التواريخ) و (منجم باشی- صحائف الاخبار). جێگەی سەرنجە کە ئەم کتێبە تائێستا هەر بە دەستنووسی ماوەتەوەو ساغ وبلاونەکراوەتەوە. بەڵام چەندین دانەی ئەم دەستنووسە لەمۆزەخانەو کتێبخانەکانی تورکیاو ئەڵمانیاو ئێران ومیسر پارێزراوە. سەرچاوەکان کتێبی (هشت بهشت) یان بەنەخشێکی نایاب لەقەڵەمداوە، هەر بۆ نمونە مامۆستا (عەبدولکەریمی مودەڕیس) دەفەرموێ: "بێ نەزیر و بێ هاوتا بووە"[٢]شایانی باسە (ئەبولفەزل محەمەد)ی کوڕی ئیدریسی بەدلیسی، دوای مردنی باوکی (ذيل) واتە پاشکۆیەکی بۆ ئەم کتێبە نووسیوە کە لەساڵی ١٥٦٦ تەواوی کردووەو بە (ذيل هشت بهشت) ناسراوە. هەروەها ناوی (سليمان نامە)شی لێنراوە، چونکە باسی سەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونی (١٥٢٠- ١٥٦٦) دەکات.[٣]

---

(١) جێگەی سەرنجە ئەم کتێبە تا ڕووداوەکانی ساڵی ١٥١٢ لەخۆدەگرێ، بۆیە هەندێ کەس وای بۆ دەچن کە لەم ساڵە تەواوبووبێ. لەوانەشە کتێبەکە لەساڵی ١٥٠٥ تەواوکرابێ ئنجا دواتر باسی ڕووداوەکانی دوای ئەم ساڵەی بۆ زیادکرابێ. محمد بايراقدار،س. پ، ل٥٥.

(٢) عبدالكريم المدرس، علماؤنا في خدمة العلم والدين، بغداد ١٩٨٣، ص٨٧.

(٣) محمد بايراقدار،س. پ ، ل٥٢-٥٦.

ئیدریسی بەدلیسی کتێبی (سەلیم نامە)شی بەشیعرو پەخشان لەسەر ژیـان و ڕۆڵـی سوڵتان سەلیمی یەکەم هۆنیوەتەوە.[1] ئەم کتێبەش کە هەر بەفارسییە لەسەر خواسـتی سوڵتانی ناوبراو نووسراوە. سەلیم نامــە کــە (٨٠) هــەزار دێـر هـۆنراوە لـەخۆدەگرێ، زانیاری زۆر گرنگی تێدایە. چونکە بەدلیسی خۆی شایەدحاڵی زۆربـەی ئـەو ڕووداوانــە بووە کە نووسیویەتی. بەڵام کاتێ ناوبراو لەساڵی ١٥٢٠دا مردووە، ئـەم دانـراوە تـەواو نەبووە. بۆیە (ئەبولفەزل)ی کوڕی دواتر تەواوی کردووە. ئەم کتێبەش هەر بەدەستنووس ماوەتەوەو چەندین دانەی لە مۆزەخانەو کتێبخانەکانی تورکیاو ئـەورووپا هـەڵگیراوە.[2] ئیدریسی بەدلیسی کتێبێکی تریشی هەیـە کـە پەیوەنـدی بـەبواری مێـژووەوە هەیـە، ئەویش (رسالة خزانیـة)یە. ئەم کتێبە کە بەفارسی نووسراوەو زۆربەی پەخشانە وناوبەناو هۆنراوەشی تێدایە، زیاتر لەشێوەی گەشتنامە دایە. چونکە ناوبراو باسـی ئـەو گەشـتە دەکا کە لەگەڵ سوڵتان یەعقوبی ئاق قۆینلودا(١٤٧٩- ١٤٩٠) لـە ئازەربیجانـەوە بـۆ ئـارران ئەنجامیـداوە. دەستنووسـی ئـەم کتێبـە لەکتێبخانـەی سـولەیمانییە لـەتورکیا پارێزراوە.[3] جگە لەوانە دەڵێن ناوبراو کتێبێکی تری مێژوویی هەیە کـەپێی دەگـوترێ (تأریخ ادریـس البدلیسـی).[4] بـەڵام دیـارە مەبەسـت لەمـەش هـەر کتـێبی (هشـت بهشت)ـە. چونکە لەنێو کتێبە نووسراوەکانی ئیدریسـی بەدلیسـی هـیچ کتێبێـك بـەم ناونیشانە نابینین.[5]

ئەم نووسراوانە لەگەڵ ئەوەی تایبەت نین بەمێژووی کورد، بـەڵام بایـەخیان بـۆ ئـەم مێژووە زۆرە. بەتایبەت بۆ ڕووداوە سەرەکییەکانی سەرەتای سەدەی شازدەم وسـەپاندنی دەسەڵاتی عوسمانی بەسەر کوردستاندا، کە دانەر خۆی لەزۆربەیان بەشـدار بـووەو ڕۆڵـی

(١) دائرة المعارف الاسلامية، (الترجمة العربية) اعداد وتحرير: ابراهيم زكي وأحمد الشنتناوي و د. عبدالحميد يونس، القاهرة(د.ت)،مج٦، مادة: ادريس البدليسي (المقال الثاني- ميناج).

(٢) محمد بایراقدار،س. پ ، ل٥٧.

(٣) هـ . س، ل٥٨.

(٤) دائرة المعارف الاسلامية، مج٦، مادة: ادريس البدليسي (المقال الثاني- ميناج).

(٥) بۆ لیستی کتێبەکانی بەدلیسی بڕوانە: محمد بایراقدار،س. پ ، ل٥٧.

کاریگەری تێدا گێڕاوە.جگە لەمەش دانانی ئەم کتێبانە لەلایەن کەسێکی کوردەوە بە بەشدارییەکی گرنگی کوردی دادەندرێ لەبواری مێژوونووسیندا.

هەر لەسەردەمی نوێدا نووسراوی مێژوویی ترمان لەبەردەستدایە، کە کوردێك نووسیویەتی وبابەتی نووسینەکەی بریتییە لەچەند لایەنێکی مێژووی کورد. مەبەستمان ئەو کتێبەیە کە ئێستا لەکتێبخانەی مێژوویی کوردی بەنێوی (مذکرات مأمون بك بن بيكة بك) شوێنێکی گرنگی گرتووە. ئەو نووسراوە سەدان ساڵ لەگەنجینەی بەڵگەنامەکانی عوسمانی بێ ناز کەوتبوو، بێ ئەوەی کەس هیچی لەبارەیەوە بزانێ. تا توێژەری تورکی (عیسمەت پارماکسز ئۆغلو) دۆزییەوەو لەگۆڤاری (بوللەتن) ساڵی ١٩٧٣ بڵاویکردەوە. کتێبەکە لەبنەڕەتدا سکاڵانامەیەکە بەزمانی تورکی عوسمانی لەلایەن مەئمون بەگی کوڕی بێگە بەگ (کە میرێکی ئەردەلانی بووەو بەدەست بەسەری لای دەسەڵاتدارانی عوسمانی گلدراوەتەوە)[1] نووسراوەو پێشکەش بەسولتان مورادی سێیەمی عوسمانی کراوە. بەبۆنەی دانیشتنی لەسەر تەخت لەساڵی ١٥٧٤. لەم نووسراوەدا مەئمون بەگ سکاڵای خۆی دەباتەبەر ئەم سولتانە نوێیەو داوای ئاوڕدانەوەی پرسۆزی لێدەکات.[2]

مەئمون بەگ لەسکاڵانامەکەیدا — کە لەڕاستیدا لەشێوەی یاداشتنامەدایە- باسی ڕووداوەکانی میرنشینی ئەردەلان دەکات، کە لەهەندێکیاندا بەشدار و لەهەندێکی تریش ئاگادار بووە. لەکاتێکدا دەولەتی عوسمانی هەر لەساڵی ١٥٣٤ەوە خەریکی سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی بوو بەسەر ئەم میرنشینە کوردییەدا، کە توانی بۆ ساڵانێکی زۆر خۆی لەبەردەم لێشاوی شاڵاوەکانی عوسمانی ڕابگرێت. سەرەنجامیش هەوڵەکانی عوسمانییەکان

(١) مەئمون بەگ دوای مردنی باوکی لەساڵی ١٥٥٠، لەلایەن عوسمانییەکان کرا بەمیری ئەردەلان. بەڵام دوای ماوەیەك لادراو بەندکرا. هەرچەندە دواتر ئازادکرا، بەڵام لەبەرئەوەی میرنشینی ئەردەلان جێگەی ململانێی هەردوو دەولەتی عوسمانی وسەفەوی بوو، عوسمانییەکان لە مەئمون بەگ دڵنیا نەبوون. بۆیە چەند ساڵێك لای خۆیان بەدەست بەسەری هێشتیانەوە. لەبارەی سەردەمی ئەم میرە بڕوانە: ماهشەرەفخانم مەستوورەی کوردستانی: مێژووی ئەردەلان، و: د. حسن جاف و شکور مستەفا، چ١، بەغدا ١٩٨٩، ل٢٨-٢٩.

(٢) مذكرات مأمون بك بن بيكه بك، ت: محمد جميل الروزبياني و شكور مصطفى، مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد ١٩٨٣، ص٣-٧.

مایەپووچ بوو. لەم ڕوانگەیەوە کتێبەکە سەرچاوەیەکی گرنگە لەبارەی ڕووداوەکانی سالآنێکی زووی مێژووی میرنشینی ئەردەلان بەتایبەتی وشارەزوور بەگشتی. بەلآم دەبێ ئەوەش بگوترێ کە مەئمون بەگ وەك سکالآنامە ئەم کتێبەی نووسیوە. بۆیە دەشێ بەپێی بەرژەوەندی خۆی ڕووداوەکانی باسکردبێت.

هەر لەچوارچێوەی نووسراوە مێژووییەکانی سەدەی شازدەم، پێویستە ئاماژە بۆ نووسراوێکی گرنگی تر بکەین کە بە (دەستنووسی زیوکی- المخطوطة الزیوکیة) ناسراوە. لەبەرئەوەی لەگوندی (زێوکان) نووسراوە، کە (٣٠کم) لەباشووری ڕۆژهەلآتی ئامێدی دوورەو دەکەوێتە ناوچەی (بەری گارەی) واتە دەوروبەری چیای گارە. ئەم دەستنووسە مێژووییە بەزمانی عەرەبی نووسراوەو باس لەمێژووی بنەماڵەی میرەکانی شەمدینان (هەکاری) وشێخەکانی زێوکان ومیرەکانی نێروە بەگشتی وبنەماڵەی میرەکانی بادینان بەتایبەتی و چەندان بابەتی لاوەکی تر دەکات. بۆیە بەسەرچاوەیەکی زۆر گرنگ دادەنرێت بۆ مێژووی میرنشینی بادینان. تەنانەت مامۆستا (ئەنوەر مایی) ناوی (مێژووی میرنشینی بادینان)ی بەشایستە دەزانێت.[1] بۆیە زۆربەی ئەو توێژەر ومێژوونووسانەی کەمێژووی ئەم میرنشینەیان نووسیوەتەوە، پەنایان بۆ بردووە. وەك (ئەنوەر مایی)[2]، (محفوظ العباسي)، (کاوە فەریق ئامێدی).[3] دواجاریش پرۆفیسۆر دکتۆر (عیماد عەبدولسەلام ڕەئوف) کارێکی گرنگ و پڕبایەخی ئەنجامدا، کاتێ ئەم دەستنووسەی ساغکردەوەو لەساڵی ٢٠٠٩ لەڕێی کتێبخانەی (تەفسیر) بلاویکردەوە. لەمەشدا پشتی بەوێنەیەکی فۆتۆکۆپی ئەم دەستنووسە بەستووە، کە لەکتێبخانەی ناوەندی زانکۆی دهۆکدا هەیە. دیارە وێنەی تریشی لەهەندێ شوێن ولەلای کەسانی تر هەن، بەلآم هەموویان لەسەر یەك دەستنووس فۆتۆکۆپی کراون.[4] ئەم دەستنووسەش

---

(١) أنور المايي، الاكراد في بهدينان،ط٢، دهوك ١٩٩٩، حاشية ص١١٥.

(٢) بڕوانە: م. ن، ص١١٥.

(٣) بڕوانە: کاوە فريق احمد شاوەلی ئامێدی، امارة بادينان ١٧٠٠-١٨٤٢/دراسة سياسية اجتماعية ثقافية، منشورات مؤسسة موكرياني/ اربيل،مطبعة خبات- دهوك ٢٠٠٠.ص٢٩، ٣٢.

(٤) بڕوانە: د. عماد عبدالسلام رؤوف (دراسة وتحقيق)، الشجرة الزيوكية/ وثيقة نسب امراء بهدينان وتأريخهم، مكتب التفسير للنشر والاعلان، اربيل ٢٠٠٩، ص١٠-١١.

پێدەچێ هەر ئەمە بێ کە (ئەنوەر مایی) ئاماژەی پێدەکا. کاتێ لەپەراوێزی کتێبی (الاکراد فی بهدینان) دا- کە لەساڵی ١٩٦٠ بڵاویکردۆتەوە- دەنووسێ: "ئەم درەختە (مەبەستی دەستنووسەکەیە) ئێستا لەلای یەکێك لەئەندامانی ئەم بنەماڵەیە کە ناوی شێخ محیەددینە".[١]

لەڕاستیدا مێژووی دانانی دەستنووسەکە بەتەواوی نازاندرێت. بەڵام لەڕێڕەوی باسکردنی زنجیرەی میرەکانی بادینان دەتوانرێ بگوترێ کە لەنیوەی دووەمی سەدەی شازدەم داندراوە. سەبارەت بەنووسەرەکەشی بەهەمان شێوە هیچ زانیارییەکمان نیە. بەڵام دەستنووسەکە دووجار سەرلەنوێ نووسراوەتەوە: جاری یەکەم بەپێنووسی مەلای زانا (محەمەد بالیسانی) لەگوندی (ئەسپیندار)ی سەربە ئامێدی. دووەم جاریش لەلایەن زانای ئایینی (تەها کوڕی مەلا عوزێر شەمدینی) لەگوندی (زێوکان) لەساڵی ١٢١٠ك/ ١٧٩٥ز.[٢]

ئەم دانراوە ناوبراوانە هەرچەندە بەشێکیان بەتایبەتی باس لەمێژووی کورد یان کوردستان دەکەن و ماوەیەکی زۆر بەر لە(شەرەفنامە) نووسراون، هەروەها سەرچاوەی پڕبایەخن بۆ مێژووی کورد و هەمووشیان بەتێکڕایی بەشداری گرنگن لەبواری مێژوونووسی کوردیدا، بەڵام دەبێ ئەوەش بگوترێ کە هەندێکیان بەدەستی کەسانی کورد نەنووسراون (وەك کتێبی: القلاع والاکراد). هەندێکیشیان مێژوونووسی کوردن، بەڵام نووسینەکانیان بەتایبەتی بۆ مێژووی کوردو کوردستان تەرخان نەکردووە (وەك: ئیدریسی بەدلیسی). هەمووشیان باس لەبەشێکی کوردستان یان لایەنێکی مێژووی ئەم وڵاتە دەکەن. لەدواییشدا بەشێکیان لەڕیزی کتێبە وونبووەکان دەژمێردرێن (وەك: القلاع والاکراد، انساب الاکراد، تاریخ آذربیجان). لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین (شەرەفنامە) ئەستێرەیەکی پڕشنگداری ئاسمانی مێژوونووسی کوردییەو (شەرەفخان)یش باوکی مێژووی کوردە. چونکە تائێستا شەرەفنامە ئەو بایەخەی خۆی لەدەست نەداوە کە (یەکەم دانراوی مێژووییە کەلەلایەن مێژوونووسێکی کوردەوە بۆ مێژووی هەموو بەشەکانی کوردستان- واتە کوردستانی مەزن- تەرخان کرابێت).

---

(١) أنور المايي، م . س، ص١١٥.

(٢) بڕوانە دەقی دەستنووسەکە لە: عماد عبدالسلام، الشجرة الزيوكية، ص٩٨.

شەرەفنامە زۆر لەوە ناسراوو بەناوبانگترە کە ئێمە تازە بیناسێنین، بەڵام بۆ پێویستی زانستی بابەتەکە دەبێ ئەوە بڵێین کە شەرەفخان کوڕی میر شەمسەددینی ڕۆژەکییە کە میری بەدلیس بوو. ناوبراو لەساڵی ١٥٩٧ گەورەترین خزمەتی بە بواری مێژوونووسی کوردی کرد، کە بەشی یەکەمی شەرەفنامەی بۆ "یەکالاکردنەوەی بنج و بناوانی کورد و ڕوونکردنەوەی باری ژیان وچۆنیەتی ئاکاریان بەدرێژایی مێژوو" تەرخانکرد. لەساڵی ١٥٩٨ بەشی دووەمیشی خستەپاڵ کە بۆ باسی سوڵتانەکانی عوسمانی وپاشاکانی ئێران وتوران وبەسەرهاتەکانی کوردستان لەنێوان ساڵانی ١٢٨٧-١٥٨٧ دا تەرخانکراوە. هەرچەندە بەشی دووەمی شەرەفنامە شتێکی ئەوتۆی لەبەشی یەکەمی کەمتر نیەو بەناوەڕۆکیش وەك ئەو ڕەسەن و دەوڵەمەندە، بەڵام بەشی یەکەم زیاتر سەرنجی مێژوونووس وشارەزایانی مێژووی ڕاکێشاوە، وەك دکتۆر کەمال مەزهەر دەڵێت. چونکە زۆربەی باسەکانی ئەم بەشە کەس پێش شەرەفخان (تەنانەت پاش ئەویش بەماوەیەکی زۆر) هیچی لەبارەیان نەنووسیوە.[1]

بایەخی گەورەی شەرەفنامە لەسوودە زانستییەکەیەتی لەبواری نووسینی مێژووی کورد بەتایبەتی ومێژووی ناوچەکە بەگشتی. تا ئێستاش هەر مێژوونووسێك توێژینەوە لەبارەی مێژووی کوردو کوردستان ئەنجام بدات، دەبێت ناوی شەرەفخان وشاکارە مەزنەکەی لەسەرووی لیستی سەرچاوەکانی تۆمار بکات. هەر مێژوونووسێکیش لەمێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەسەدەکانی (١٤-١٦) بکۆڵێتەوە، دەستبەرداری شەرەفنامە نابێت بەهەردوو بەشەکەیەوە.

ئەو زانیاری و ووردەکارییانەی کەشەرەفنامە لەبارەی ڕووداوەکانی کوردستان لەخۆی گرتووە، وێنەیان لەسەرچاوەی تر دەست ناکەوێت. سنوور ودەسەڵات وململانێ وڕەوشی سیاسی میرنشینە کوردیەکان وهەروەها سیاسەتەکانی هەردوو دەولەتی عوسمانی وسەفەوی و دەولەتانی تورکمانی بەرامبەر کوردستان ومیرنشینە کوردیەکان، شانبەشانی زانیاری مێژوویی تر، لەگرنگترین لایەنەکانی ناوەڕۆکە دەوڵەمەندەکەی شەرەفنامەن.

---

(١) کەمال مەزهەر، س. پ، ل١٠٥-١١١. هەروەها بڕوانە: شرفخان البدليسي، الشرفنامە، ت: ملاجميل بندي الروزبياني، ط١، بغداد ١٩٥٣.

دەتوانین بڵێین بایەخی شەرەفنامە لەوەدایە کەدانەرەکەی لەلایەك هاوچەرخی زۆربەی ئەو ڕووداوانە بووە کە کتێبەکە باسیان دەکات. لەلایەکی تریش وەك میری میرنشینێکی کوردی بەشداری لەدروستکردنی هەندێکیاندا کردووە. ئەم دوو خاڵەش لەمەرجە بنەڕەتیەکانی ڕەسەنایەتی وبەهاداری هەر سەرچاوەیەکی مێژوویین. ئەمە لەپاڵ هەڵوێستی ڕەخنەگرانەو بابەتیانەی نووسەر، کە دەتوانین بڵێین شەرەفخان لەم دوو مەرجەی دوایيش بێ بەهرە نیە. کەواتە شەرەفنامە سەرچاوەیەکی مێژوویی کوردی ڕەسەن وزۆر گرنگە.

**دووەم: کورد ومێژوو لەسەدەکانی حەڤدەو هەژدەمدا:**

کاروانی مێژوونووسی کوردی دوای شەرەفخان بەقۆناغێکی داکشانی درێژخایەندا تێپەڕی، کەدەتوانین بڵێین تاسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمی خایاند. لەم ماوەیە دوورو درێژەدا تەنیا چەند هەوڵێکی کەمی مێژوونووسینمان بەرچاو دەکەوێت: هەندێ لەمانە تەنیا بریتین لەهەوڵی درێژکردنەوەو تەواوکردنی نووسینەکانی پێشوو لەڕێگەی نووسینی پاشکۆ بۆیان، بەتایبەتیش بۆ کتێبی شەرەفنامە. دیارە بایەخ وگرنگی شەرەفنامە بۆ مێژووی کورد و بواری مێژوونووسی کوردی نەك هەر ئێستا بەڵکو لەسەدەکانی پێشتریش بۆ ڕوناکبیران وخوێندەوارانی کورد ڕوون وئاشکرا بووە، ئەوەتا هەر زوو هەست بەو کەلێنە گەورەیە کراوە کە دوای تەواوبوونی ئەم کتێبە ومردنی شەرەفخان دروستبووە. بۆیە لێرەو لەوێ هەوڵدراوە بەنووسینی پاشکۆ بۆ ئەم کتێبە کەلێنەکە پڕبکرێتەوە.

یەکی لەم هەولانە پاشکۆیەکی تایبەتە بە (حاکمانی گەڵباخی) کە لەساڵی ١٦٨١دا نووسراوە. دیارە نووسەری ئەم پاشکۆیە لەژێر سایەی ئەم دەسەڵاتدارانە ژیاوە، یان هەر تەنیا زانیاری لەبارەی ئەوان هەبووە، بۆیە هەر ئەم پاشکۆیەی بۆ شەرەفنامە زیادکردووە. ئەم پاشکۆیە لەپەراوێزی کتێبەکە دانراوە لەو چاپەی کە ڕۆژهەڵاتناسی ڕوسی (ولیامینۆڤ زێرنۆڤ) لەساڵی ١٨٦٢ لەپترسبۆرگ بڵاویکردۆتەوە. هەروەها لەوچاپەی شەرەفنامەشدا دەبینرێ کە محەمەد عەلی عەونی پەراوێزی بۆ نووسیوەو فەرەجوڵلا زەکی کوردی لەمیسر بڵاویکردۆتەوە.[1]

(١) ئەنوەر سولتانی،دوو زەیلی شەرەفنامەی بتلیسیی، بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین،سلێمانی ٢٠٠٥، ل١٢.

پاشکۆیەکی تر لەساڵی ١٦٨٧ نووسراوەو (شەمعی) ناوێك داینــاوە. ئــەم زاتــە لەسەروبەندی وەرگێڕانی شەرەفنامە بۆ سەر زمانی تورکی، مێژووی هەردوو میرنشینی (ئەگیل) و (پالو)ی لەو شوێنەی کەشەرەفخان لێی وەستاوە (ساڵی ١٥٩٧) تا سەردەمی خۆی، هەر بەزمانی تورکی تەواوکردووە. بێ ئەوەی لەم شوێنەدا ئاماژە بەم کارەی خۆی بکــات. دەستنووســی ئــەم پاشــکۆیە لــە کتێبخانــەی بریتــانی (لەنــدەن) بــەژمارە (Add.18547) پــارێزراوە. ڕونــاکبیری کوردســتانی ڕۆژهــەڵاتیش (ئــەنوەر ســوڵتانی) پەیدای کــردووەو وەریگێڕاوەتــە ســەر زمــانی کــوردی. ئنجــا لــەژمارە (٧)ی گۆڤــاری (گــزینگ) بڵاویکردۆتــەوە کــە لەبــەهاری ٢٠٠٠ لەســوید دەرچــووە. دواتــر وێنــەی دەستنووسەکە بەدەقی خۆی لەگەڵ وەرگێڕانە کوردیەکە لەڕێگەی بنکەی ژین لەسلێمانی لەســاڵی ٢٠٠٥دا لــەدوو تــوێی کتێبێکــدا –کــە پاشــکۆیەکی تــری شــەرەفنامەش لەخۆدەگرێ- بڵاوکراوەتەوە.[1]

لەپاڵ ئەمانە دوو هەوڵی سەربەخۆش بەرچاو دەکــەون بــۆ نووســینەوەی مێــژوو لــەم ماوەیەدا: یەکەمیان نووسراوێکی گرنگی (ابــن محمــد) ناوێکــە کــە ناونیشــانی (تــاریخ کردستان)ی هەڵگرتووە. دەستنووسی ئەم کتێبە کە (٢٧٠) لاپەڕەیەو بــەزمانی فارســی لەساڵی ١٧٠١ز نووسراوە، تا ئەم ســاڵانەی دوایــی لــە (مکتبــة العســکریین العامــة في مدرسة الامام الشیرازي) لە سامەڕرا هەڵگیرابوو. بەڵام دواتر کە ئەو کتێبخانەیە خرایــە سەر کتێبخانەی مۆزەخانەی عیراقی، ئــەم دەستنووســە نــاوبراوە لــەنێوی دا نــەبوو.[2]
بێگومان بایەخ و گرنگی ئەم دەستنووسە بۆ کاروانی مێژوونووسی کوردی وگەورەیی ئەو زیانەی کە بەونبوونی لەنووسینی مێژووی کورد دەدات، زۆر بەچاکی زانراوە، بۆیە دیارە بەدەستی ئەنقەست سەرنگوم کراوە.

هەوڵی دووەمیشیان بریتییە لەگەشتنامەیەکی مێژوویی کە قوتابیەکی ئایینی کورد لەسەدەی دوازدەی کۆچی (هەژدەی زایینی) پێی هەســتاوە. ئــەم قوتابیــە کــە (تــەهای کوڕی یەحیای کوردی بالیسانی)یە -وەك نێوی خۆی لە دەستنووسەکەدا نووســیوە- بــۆ

(١) بڕوانە: هـ . س، ل٥-٧٨.

(٢) د.عماد عبدالسلام رؤوف، التأریخ والمؤرخون العراقیون في العهد العثماني، ط١، بغداد، ص٩١، کورکیس عواد، ماضي الاکراد وحاضرهم في المصادر العربیة القدیمة والحدیثة، ص٣٥.

خوێندن زۆربەی شارەکانی کوردستانی کردووە، ئنجا چووەتە شام و لەوێشەوە بۆ میسر. ناوبراو تێبینیەکانی خۆی سەبارەت بەگەشتەکەی و ئەو شوێنانەی کەپێیانـدا تێپـەڕیوە لەدەستنووسێکدا تۆمار کردووە. ئەم دەستنووسە کە دەکرێ وەك گەشتنامە و هـەروەها وەك یادداشتیش ئەژمار بکرێ،ئێستا تاکە دانەی لە (دار الكتب المصرية) لـە قـاهیرە لـەژێر ژمـارەی (٣٧٣ جوگرافیـا) هـەڵگیراوە. دەستنووسـەکە (٩٤) پـەڕ (وەرەقـە) لەخۆدەگرێ وهەر یەکێشیان (٢٥) دێری تێدایە وبەخـەتی نوسـخی ئاسـایی نووسـراوە. لەهەنگاوێکی گرنگدا، مێژوونووسی عیراقی (دکتۆر عیماد عەبدولسەلام رەئـوف) لـەم ساڵانەی دوایـی ئـەم دەستنووسـەی سـاغکردۆتەوەو دوو چـاپی لـێ بڵاوکردۆتـەوە.[١] بێگومان ئـەم کتێبـە سـوودمەندە بـۆ ئاشـنابوون بـەبارودۆخی ئـاوەدانی وشارسـتانی کوردستان وهەردوو وڵاتی شام ومیسر لەسەدەی هەژدەمدا.

دوای باسکردنی ئەم دانراوانە دەبێ بەڕاشکاوی ئەوە بڵێین کە تەنیا ئەم چەند هەوڵـە کەمەی مێژوونووسی لەماوەی دوو سەدەی ڕەبەقدا، بەهیچ شێوەیەك لەئاستی پێویستدا نین.سەرباری ئەمەش -وەك بینیمان- تەنیا دوویان هەوڵی نووسینی کتێبی سەربەخۆن. ئەوانیش زۆر جێگەی دڵخۆشی نـین، چـونکە بەرهـەمی یـەکێك لـەم هەوڵانـە تووشـی لەناوچوون هاتووەو هەوڵەکەی تریش هەرچۆنێك بێت تـەنیا بریتییـە لەگەشـتنامەیەك، کەناچێتە چوارچێوەی مێژوونووسین بەواتای تەواوی زاراوەکە. لەبەرئەوە ماوەی ئـەم دوو سەدەیە وەك کەلێنێکی گەورە ماوەتەوەو بەهەرچی هۆکارێك بێت بەلاپەڕەیەکی تاریـك دادەنرێت لەتۆماری مێژوونووسی کوردیدا. هـەر ئەمـەش بووەتـە تەگەرەیـەکی گـەورە لەبەردەم نووسینی مێژووی سەدەکانی حەڤدەو هـەژدەی کـوردو کوردسـتان بەگشـتی. چونکە ئەمە وایکردووە کە ناچارین پەنا ببەینە بەر ئەم ئاماژە کەمەو کورتـە باسـانەی کە لەبارەی کوردەوە لەو نووسراوە مێژووییانەدا هاتووە کە بەدەستی ڕۆڵەی ئەو میللەت و دەولەتانـە نوسـراونەتەوە کـە بـەردەوام کوردیـان سـەرکوت کـردووەو کوردسـتانیان

(١) بڕوانە: رحلة طه الكردي الباليساني في العراق وبلاد الشام والاناضول ومصر والحجاز، مقتبسات حققها وعلق عليها: الدكتور عماد عبدالسلام رؤوف، ط١،دار الثقافة والنشر الكردية، بغداد ٢٠٠٢. رحلة طه الكردي الباليساني في العراق وبلاد الشام والاناضول ومصر والحجاز، تحقيق: الدكتور عماد عبدالسلام رؤوف، ط٢، مؤسسة موكرياني للبحوث والنشر، اربيل ٢٠٠٧.

داگیرکردووە. واتە پەنا دەبردرێتە بەر نووسراوی دوژمنان. کەبێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی وەرگرتنی وێنەیەکی شێواو لەبارەی مێژووی کورد وفەرامۆشکردنی ڕۆڵی ئەم نەتەوەیە لەبنیادنانی شارستانیدا.

**پەرەسەندنی مێژوونووسین لەسەدەی نۆزدەمدا:**

کە چاو بەسەدەی نۆزدەهەمدا دەخشێنین، بەپێچەوانەی دوو سەدەکەی پێشتر دەبینین کاروانی مێژوونووسی کوردی هەنگاوی بەگوڕ دەهاوێ. ئەوەتا چەندین سەرچاوەی مێژوویيمان لەبەردەستدایە کە بەدەستی مێژوونووسانی کوردی ئەو سەدەیە نەخشێنراون. جێگەی سەرنجە لەم بارەیەوە جێ پەنجەی ڕۆڵە کوردەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات، بەتایبەتی لە میرنشینی ئەردەلان، زۆر دیار و کاریگەرە.

نۆبەرەی کاری مێژوونووسی کوردی لەسەدەی نۆزدەم، لەدەستپێکی سەدەکەدا (ساڵی ١٨٠٠ز) لەدایك بوو. ئەویش کتێبی (زوبدەتولتەواریخی سەنەندەجی)ی (مەلا محەمەد شەریف)ی قازی ئەردەلانە. ناوی بنەڕەتی کتێبەکە تەنیا (زبدە التواریخ)ـە بەڵام لەبەرئەوەی چەند کتێبێکی تر بەم ناوە هەن، بۆیە ووشەی (سنندجی) بۆ زیادکراوە تا لەوانیتر جیابکرێتەوە.[(١)] تاکە دەستنووسێکی ئەم کتێبە لەکتێبخانەی زانکۆی (کامبریدج) پارێزراوە. بەڵام پێدەچێ دانەی تری لەکتێبخانەی تایبەتی کەساندا هەبێ. ئەم دانراوە بەشێوەی مێژووی گشتی نووسراوەو لەپێشەکی ودوازدە بەش وکۆتایی پێکهاتووە. هەرچەندە بەپێی ناونیشانەکەی وادەردەکەوێ کەکتێبەکە بەتەنیا باسی مێژووی ئەردەلان و شاری سنە بکا، بەڵام تەنیا بەشی یازدەی کتێبەکە لەبارەی "نەژادی کورد وبنەماڵەی والی ومیرەکانی ئەردەلان" دەدوێ. کە بێگومان ئەو بەشە گرنگترین وقەبەترین بەشی کتێبەکەیە.[(٢)] ئەم کتێبە سەرچاوەیەکی مێژوویی بەبایەخ

(١) نەوشیروان مستەفا ئەمین، لەپەراوێزی مێژووی ئەردەلان دا، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپخانەی ئۆفسێتی بابان، سلێمانی ١٩٩٩، ل٨.

(٢) ی. ئی. ڤاسیلیەڤا، کوردستانی خواروری ڕۆژهەڵات لەسەدەی حەڤدەوە تا سەرەتای سەدەی نۆزدە (کورتەیەکی مێژووی میرنشینانی ئەردەلان وبابان)- موسکۆ ١٩٩١، و: د. ڕەشاد میران، هەولێر ١٩٩٧، ل١٧-١٨.

وگرنگە، بەتایبەتی بۆ مێژووی میرنشینی ئەردەلان. هەر لەبەرئەوەیە کە بۆتە سەرچاوەیەکی ڕەسەن بۆ زۆر لەم دانراوە مێژووییانەی کەدواتر لەبارەی مێژووی ئەردەلان نووسراون. لەوانە (تاریخی ئەردەلان) ی ماهشەرەفخانمی ئەردەلانی، کە دواتر باسی دەکەین.

جێگەی سەرنجە کە لەم سەدەیەش بەهەمان شێوەی سەدەکانی حەڤدەو هەژدە، هەندێ هەوڵ لەئارادابوون بۆ پڕکردنەوەی کەلێنی دوای شەرەفنامە. لەم چوارچێوەیەدا (محەمەد ئیبراهیمی ئەردەلانی) لەساڵی ١٨١٠ز دەتوانێ پاشکۆیەکی تایبەت بەمیرنشینی ئەردەلان بۆ شەرەفنامە بنووسێ. دەستنووسی ئەم پاشکۆیە بەهۆی (جۆن مالکۆلم — کە دپلۆماتکارێکی بریتانی بوو لەئێران لەسەرەتای سەدەی نۆزدەمدا) خۆشبەختانە لەوونبوون پارێزرا.[1] بەشێکی ئەم چاکەیە بۆ (ئەمانوللا خانی ئەردەلان) دەگەڕێتەوە کە ئەم پاشکۆیەی بەناوبراو داوەو ئەویش خستویەتیە سەر دەستنووسێکی شەرەفنامە کە ئێستا لەکتێبخانەی (ئەنجومەنی پادشایی ئاسیایی بریتانیا) لە لەندەن بەژمارە (١٥٨) پارێزراوە. مامۆستا (ئەنوەر سوڵتانی) ئەم پاشکۆیەی وەرگرتووەو کردوویەتیە کوردی و سەرەتا لەگۆڤاری (دەروازە/ ژمارە-١- ساڵی **١٩٩٣** کە لە دانیمارك دەرچووە) بڵاویکردۆتەوە. دواتر بە هاوکاری خاتوو (نەسرین برنا) ئەم وەرگێڕانەو دەقە بنەڕەتیە فارسییەکەی وەك نامیلکەیەکی سەربەخۆ لەساڵی **١٩٩٧** لەڕێگەی (پەخشنامەی نەورۆز) لەووڵاتی سوید بڵاوکردەوە.[2]

هەرچەندە (محەمەد ئیبراهیمی ئەردەلانی) ی نووسەری ئەم پاشکۆیە بەمێژوونووسی دەربار ئەژماردەکرێ، بەو پێیەی ڕووداونویس (وقائع نگار)ی ئەمانوللا خانی میری ئەردەلان بووە، بەڵام خودی پاشکۆیەکە کە لە (١٣) لاپەڕە پێکهاتووە بایەخێکی بەرچاوی هەیە. چونکە زۆر لایەنی مێژووی سیاسی وکۆمەڵایەتی کوردستان لەماوەی زیاتر لەدوو سەدە — لەنێوان ساڵی تەواوبوونی شەرەفنامە (١٥٩٧) وساڵی نووسینی پاشکۆیەکە (١٨١٠)- ڕووندەکاتەوە. هەروەها نووسەری ئەم پاشکۆیە بۆ زانیاریەکانی، پشتی بەهەندێ سەرچاوەی ڕەسەن بەستووە، بەتایبەتی (عالم ارای عباسی) و

---

(١) هـ . س ، ل٢١.

(٢) ئەنوەر سولتانی، س . پ، ل١٢-١٣.

(جهانگشای نـادری).[1] ئـەوەی یەکـەمیان دانـراوی (ئەسـکەندەر بـەگی تورکمـان)ی مێژوونووسی شاعەباسی یەکەمی سـەفەوی (١٥٨٧-١٦٢٩ز) یـە. دووەمیشـیان هـی (میرزا مەهدی خـانی ئسـترابادی)یە کـە ڕووداونـویس وهـاودەمی نادرشـا (١٧٣٦-١٧٤٧ز) بوو. بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە نووسەری ئەم پاشکۆیە هیچ ئاماژە بەکتێبەکەی (مەلا محەمەد شـەریفی قـازی) ناکـا، ئەگەرچـی ئـەویش تایبەتـە بەمێژووی ئەردەلان.[2]

هەر لەم مەیدانەدا (ئیسماعیل کـوڕی مـەلا محەمـەد حوسـێنی ئـەردەلانی) سـاڵی ١٨٢٨ز کتێبی (تاریخی ئەردەلان)ی دانا بۆ تـەواوکردنی ئـەو بەشـەی شـەرەفنامە کـە تایبەتە بە فەرمانڕەوایانی ئەردەلان.[3] پاشـکۆیەکی تـری شـەرەفنامە لەسـاڵی ١٨٤٢ لەلایەن میرزا مەحمودی بانەیی نووسراوەو تەنیا باسی (حاکمانی موکریان) لەخۆدەگرێ. دیارە ئەم پاشکۆیە لەکتێبی (لاپەڕەیەك لەدیرۆکی موکریان)ی مامۆستا حوسێن حوزنی موکریانیدا بڵاوکراوەتەوە.[4]

هەر لەم ماوەیەدا و هەر لەکوردستانی ڕۆژهەڵاتدا، بـەڵام ئـەمجارەیان لـەنێو کـوردە (دونبولی)یـەکان دوو مێژوونووسـی بـەتوانا سـەریانهەڵدا کـە یـەك لـەدوای یـەك (عەبدولڕەزاق بـەگی کـوڕی نەجـەف قولیخـانی دونبـولی- سـاڵی ١٨٢٨ مـردووە) و (ڕۆستەم خانی کوڕی ئەحمەد خانی دونبولی)ن. بەپێی گوتەی (دکتۆر کـەمال مەزهـەر) یەکەمیان تەنیا کتێبی (تاریخ الدنابلە)ی داناوەو دووەمیشیان هەردوو نووسراوی (اشارة المذاهب) و (اشـارة الادیـان)ی هەیـە.[5] بـەڵام لـەنێو لیسـتی سەرچـاوەکانی کتـێبی (فەرمانڕەوایانی موکریان)ی مامۆستا (محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی) چاومان بـەناوی دوو

---

(١) بڕوانە دەقی فارسی و وەرگێڕانە کوردییەکەی پاشکۆیەکە لەگەڵ پێشەکی ئەنوەر سوڵتانی لە: هـ . س ، ل٨٣-١٨٠.

(٢) لەم بارەیەوە بڕوانە: نەوشیروان مستەفا ئەمین، س . پ، ل٩.

(٣) شەرەفخانی بەتلیسی، شەرەفنامە، و: هەژار،بەغدا ١٩٧٣، ل١٩٥ (پەراوێز)، هەروەها: ی. ئی. ڤاسیلیەڤا، س . پ، ل٢٢.

(٤) ئەنوەر سوڵتانی، س . پ، ل١٣.

(٥) کەمال مەزهەر، س. پ، ل١٣١.

کتێبی تری (عەبدولڕەزاق بەگی دونبولی) دەکەوێ، ئەوانیش: (تجربة الاحرار وتسلية الابرار) و (مآثر سلطانية)ن.[1] دیارە ئەو دوو کتێبەی دوایی چاپکراون و بڵاوکراونەتەوە. تەنانەت خۆشم لەکاتی نووسینی تێزی دکتۆراکەم سوودم لەکتێبی (تجربه الاحرار) بینی کە لەلایەن (حەسەن قازی تەباتەبایی) ساغکراوەتەوە.[2] بەڵام سێ کتێبەکەی پێشتر بەیەکەوە لەکتێبخانەی (ماتێنەدەران) هەڵگیراون. زانیاریەکانی ئەم دانراوانە بەتایبەتی ئەوانەی کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەو سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە بایەخی مێژووییان زۆرە، چونکە دانەرەکانیان هاوچەرخ و تەنانەت بەشدار بوونە تیایاندا.[3]

مێژوونووسین لەژێر سایەی میرنشینی ئەردەلاندا پێشکەوتنێکی دیاری بەخۆوە بینی، دیارە هەر لەبەر ئەوەیە کەزۆربەی مێژوونووسە کوردەکانی ئەم میرنشینە دانراوەکانیان بەمێژووی ئەردەلان و بەنێوی (مێژووی ئەردەلان) نەخشاندووە. ئەوەتا (خوسرەو کوڕی محەمەد کوڕی مەنوچەهر)ی ئەردەلانی ساڵی (١٢٤٩ك /١٨٣٣ز) کتێبی (تاریخی بەنی ئەردەلان/ یان: تاریخی ئەردەلان)ی دانا.دەستنووسێکی ئەم کتێبە لەکتێبخانەی نیشتیمانی پاریس هەڵگیراوە. تا ساڵی ١٩٧٩ وادەزانرا ئەم دەستنووسە تاکە دانەیە. بەڵام کە لەوساڵە لە (تاران) کتێبێك بەناوی (لوببی تەواریخ) بەپێشەکییەکی کورتی (دکتۆر ئیسماعیل ئەردەلانی) بڵاوکرایەوە، دەرچوو ئەمەی دوایی دەستنووسێکی تری هەمان کتێبەکەی (خوسرەو کوڕی محەمەد)ە. دواتریش بە بەراورد کردن دەرچوو دەستنووسەکەی پاریس هەرچەندە نوێترە، بەڵام بەگوتەی (ڤاسیلیەڤا) زانستی ترە، بۆیە هەر لەلایەن ئەم کوردناسە ڕوسییەوە کرایە بنەما و لەساڵی ١٩٨٤ لەگەڵ وەرگێڕانی بۆ زمانی ڕوسی وپێشەکی وپەراوێز بۆ نووسینی بڵاویکردەوە.[4] بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین

---

(١) بڕوانە: محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی، فەرمانڕەوایانی موکریان، بەغدا، ١٩٩٢، ل١١٣.

(٢) بڕوانە: عبدالرزاق بيك دنبلي، تجربة الاحرار وتسلية الابرار، تصحيح: حسن قاضي طباطبائي، انتشارات مؤسسة تاريخ وفرهنك ايران/ دانشگاه تبريز، چاپخانه شفق، تبريز ١٣٤٩ش.

(٣) کەمال مەزهەر، س. پ، ل١٣٢.

(٤) ی. ئی. ڤاسیلیەڤا، س . پ، ل١٨-١٩.

کە دەستنووسەکەی تاران ڕەسەنترە، چونکە بەپێی گوتەی (دکتۆر ئیسماعیل ئەردەلانی) بەخەتی خودی نووسەر نووسراوە.[1]

خوسرەو بەگ خۆی لەبنەماڵەی میرانی ئەردەلانە وباب وباپیرانی لەدەرباری میرانی ئەردەلاندا خاوەن پلەو پایە بوون. بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئەو مێژوونووسی دەربار نەبوو، چونکە خۆی لەپێشەکی کتێبەکەیدا دەڵێ کە لەسەر داوای کەس ئەم کتێبەی نەنووسیوە و هەروەها تەماع و پارەو پولیش پاڵیان پێوە نەناوە بۆ ئەم کارە. بەڵکو ئەو تەنیا لەدەستبەتاڵی، خۆی بەم کارە بەسوودە خەریك کردووە. سەبارەت بەسەرچاوەکانیشی دیارە سوودی لە شەرەفنامە و هەندێ سەرچاوەی گرنگی تر بینیوە وەك (جهانگشای نادری)، ئەمە لەپاڵ گێڕانەوەکانی کەسانی ئاگادار لەڕووداوەکان و هەروەها بینین و بیستنەکانی خۆی، بەتایبەتی کە خۆشی لەڕووداو وپێشهاتەکان نزیك بووە. بۆیە ئەم کتێبە سەرچاوەیەکی بەپێز وگرنگە بۆ مێژووی ئەردەلان.[2]

کتێبی (تاریخی ئەردەلان)ی (ماهشەرەفخانمی کوردستانی)ش کە ساڵی ١٨٤٦ز نووسراوە، هەر لەڕیزی ئەو دانراوە ناوبراوانەن کە لەژێر سایەی میرنشینی ئەردەلاندا نووسراون. ئەم خاتوونە کە بەنازناوە شیعرییەکەی (واتە: مەستورە) ناسراوە، کچی ئەبولحەسەن بەگی کوڕی محەمەد ئاغایە. هەروەها کچی مامی (سادق ئەلمولك)ە وهاوسەری خوسرەو خانی ناکامی میری ئەردەلانە. مەستورە لەساڵی ١٨٠٥ز لەشاری سنە لەدایکبووەو لەساڵی ١٨٤٧ز بەنەخۆشی ڕشانەوە لەشاری سلێمانی مردووە.[3]

مەستورە لەگێڕانەوەی ڕووداوەکانی پەیوەند بەئەردەلان تا ساڵی نووسینی کتێبەکە بەردەوام دەبێت، لەبەرئەوە لەنووسینی مێژووی ساڵەکانی دوایی کەخۆی هاوچەرخیان بووە تاڕاددەیەکی زۆر ووردە. ئەمە بەپێچەوانەی مێژووی ڕووداوە کۆنەکان کە هەڵەی زەقیان تێدایە و بەدەگمەن کات وساتی ڕووداوەکان باس دەکات. سەرەڕای ئەمەش لەخوێندنەوەی کتێبەکە هەستی ڕەخنەگرانەو هەوڵی لێکدانەوەی بابەتیانەمان

---

(١) نەوشیروان مستەفا ئەمین، س . پ، ل١١.

(٢) هـ . س، ل١٠-١٢.

(٣) ماهشەرەفخانم مەستورەی کوردستانی، مێژووی ئەردەلان، و: د. حەسەن جاف وشکور مستەفا، چ١، بەغدا ١٩٨٩، ل٥.

بەرچاودەکەوێت. بۆ نمونە زۆرجار زانیارییەکانی هەردوو کتێبی (زوبدەتولتەواریخی سەنەندەجی مەلا محەمەد شەریفی قازی) و (تاریخی بەنی ئەردەلانی خوسرەو)، کە دوو سەرچاوەی سەرەکی ئەم کتێبەن، لەبارەی یەك ڕووداو بەراورد دەکات.

تاکە دەستنووسێکی ئەم کتێبە دوابەدوای گەڕانێکی زۆر بەدەست کەوت ولەساڵی ١٩٤٦ لەسنە لەلایەن (ناسر ئازاد پەروەر) چاپکراو بڵاوکرایەوە.[1] بەڵام هێشتا لەبەردەستی خوێنەرانی کورد دانەبوو، تا لەساڵی ١٩٨٩ لەلایەن هەردوو مامۆستا (د. حەسەن جاف) و (شکور مستەفا) وەرگێڕدرایە سەر زمانی کوردی وبڵاوکرایەوە.[2] ئیتر لەوکاتەوە بووە سەرچاوەیەکی ڕەسەنی گرنگ بەدەست خوێنەر ومێژوونووسانی کوردەوە. لەم ساڵانەی دواییش لەلایەن مامۆستا (هەژار) وەرگێڕانێکی تری بۆ کراو هەروەها لەگەڵ سەرچاوەی تریش بەراورد کرا، ئیتر چاپی یەکەم ودووەمی دووبارە بەزمانی کوردی بڵاوکرایەوە.[3]

هاوکات لەگەڵ ئەمانە لەکوردستانی سەربە دەولەتی عوسمانییش چەند هەوڵێکی مێژوونووسینمان بەرچاو دەکەوێت. دیارە بووژانەوەی ڕۆشنبیری ڕەنگدانەوەی پەرەسەندنی بارودۆخی سیاسییە، ئەوەتا میرنشینی سۆران کە لەسەردەمی محەمەد پاشای گەورە (١٨١٣-١٨٣٦) پێشکەوتنێکی دیاری بەخۆوە بینی، ئەم پێشکەوتنە بووە هۆی بەرەوپێشچوونی تر لەبارودۆخی هەمەلایەنەی ژیان. مێژوونووسینیش یەکێك بوو لەو لایەنانە، لەسۆران لەو سەردەمەدا دوو هەوڵی نووسینی مێژوومان بەرچاودەکەوێت. یەکێك لەو هەوڵانە بەهاندانی پاشای گەورە خۆی هاتۆتەبەر.

مامۆستا (حوسێن حوزنی موکریانی) لەکتێبی (مێژووی میرانی سۆران) دەڵێت "لەو ساڵەدا (١٢٣٣ك /١٨١٨ز) میر [محەمەد پاشا] بەمیرزا محەمەدی وەقائیع نگار وسەرنووسەری وت کە هەموو کردەوەو سەربوردی میر بنووسێتەوە، ئەویش بەفارسی وبەشیعر دەستی کردە نووسینەوە. هەتا دوایەمینی ڕەسووڵ پاشای وتووەو ناوی ناوە

(١) ی. ئی. ڤاسیلیەڤا، س . پ، ل٢٠.

(٢) بڕوانە: ماهشەرەفخانم مەستورەی کوردستانی، س . پ.

(٣) بڕوانە: مەستورەی کوردستانی، مێژووی ئەردەلان، و: هەژار، چ٢، دەزگای ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر ٢٠٠٥.

(مەلیخا)، ئەو کتێبە لەکن گەلێك کەسی ڕەواندزی هەبووە، بەڵام لەهاتنی ڕوس ومهاجراتی خەڵکی ڕەواندز لەنێوچووە. تەنیا دانەیەکم دەست کەوت بۆ نووسینەوەی ئەم پەڕاوەیە".[1] ئەوەی دەمانگەیەنێتە ئەو ڕایەی کە ئەم دانراوە سەرچاوەیەکی گرنگە، ئەوەیە کە هەر (موکریانی) خۆی دەڵێت: "زۆر بەکارم هات، چونکە بەدرێژی سەربوردیان باس دەکات".[2] لەڕاستیشدا هەروایە، چونکە لەزۆر شوێندا و لەزانیاری گرنگدا ئاماژەی بۆ (مەلیخا) کردووە. هەرچۆنێك بێت هاوچەرخیی نووسەر لەگەڵ ڕووداوەکان و نزیکی لەکاروباری میر وادەکەن کە سەرچاوەکە بایەخی تایبەتی خۆی هەبێت. بەڵام هەوڵی دووەم شێوەی یادداشتی وەرگرت، زانای بەناوبانگی کورد (محەمەد کوڕی ئادەم) کە لەژێر سایەی میرنشینی سۆراندا خزمەتی زۆری ئایینی پیرۆزی ئیسلامی کرد و چەندین زانای پێگەیاند وچەندین نووسراوی لەدوای خۆیدا بەجێهێشت.[3] زۆربەی ئەم نووسراوانە بابەتی ئایینین، بەڵام یەکێکیان کە هەر بەدەستنووسی ماوەتەوە تا ئەم ساڵانەی دواییش لەکتێبخانەی تایبەتی (دکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر) هەڵگیرابوو.[4] ئەویش بریتییە لەسەربوردەی ژیانی خۆی کە بەزمانی عەرەبی وشارەزایانە نووسیویەتی. بێگومان ئەم دەستنووسە دەچێتە خانەی یادداشتی مێژوویی کەشێوازێکی نووسینی مێژووەو دەبێتە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ لێکۆڵینەوە لەمێژووی ئەو سەردەمە. چونکە گومان لەوەدا نیە کەیادداشتنووس باسی ڕووداوەکانی سەردەمی خۆی دەکات. ئەمە لەلایەك و لەلایەکی تر ژیننامەی زانایەکی گەورەی وەك (محەمەدی کوڕی ئادەم) زانیاری گرنگمان سەبارەت بەژیانی ڕۆشنبیری ئەو سەردەمەی مێژووی کورد پێدەبەخشێ.

---

(١) حوسێن حوزنی موکریانی، مێژووی میرانی سۆران، چ٢، هەولێر ١٩٦٢، ل٥٤.

(٢) هـ . س، ل٥٤.

(٣) سەبارەت بەژیان و نووسراوەکانی کوڕی ئادەم بڕوانە: زبیر بلال اسماعیل، علماء ومدارس في اربیل.

(٤) بەپێویستی دەزانم ئەوە بڵێم کە دکتۆر ئەحمەد ئێستا (واتە ساڵی ١٩٩٨) چارەنووسی دەستنووسەکە نازانێ، چونکە خۆی لەهەولێرە وکتێبخانەکەی لەبەغدا بەجێهێشتووە. شایانی باسە لەم دواییەدا بۆم ڕوون بۆوە کە دانەی تری ئەم دەستنووسە لەکتێبخانەی مۆزەخانەی نیشتیمانی بەغدا هەڵگیراوە.

هەر لەکوردستانی عوسمانی، بەڵام لەوپەڕی باکور لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا قوتابخانەی مێژوونووسی کوردی زانایەکی پایەبەرزی لێ هەڵکەوت کە (مەلا مــەحمودی بایەزیدی)یە، بایەزیدی وێڕای بەشداری زۆری لەبواری ئەدەبدا، ڕۆڵی بەرچاوی لەمەیدانی مێژوونووسیدا گێڕاوەو بەیەکەم وەرگێڕی شەرەفنامە بۆ زمانی کوردی دادەنرێت. کەچی دانــەی ئــەم وەرگێــردراوە کــە بەدەســتخەتی بایەزیــدی خــۆی نووســرابوو تــا ئێســتا لەکتێبخانەی گشتی (سەلتیکۆف شێدرێن ) لە (لینینگراد / پترۆگــراد) بەدەستنووســی ماوەتەوە. دیارە خەریکبوون لەگەڵ شەرەفنامە و ئاشنابوون لەگــەڵ هەســتی مێــژوویی شەرەفخان، مەلا مەحمودیان هانداوەو سەودای مێژوونووسینیان خستۆتە سەری. ئــەوەتا بایەزیدی ویستی ڕێگەی شەرەفخان بگرێتەبەر ولەسەر ڕێوشوێنی ئــەو مێــژووی کــوردو کوردستان لەســەردەمەکانی دوای ئــەو بنووســێتەوە. لەســاڵی (١٨٥٨ز) ئــەو نیــازەی بایەزیدی هاتەبەر و"کیتابی تاریخی جدیدی کوردستان" ی نووسی کــە نزیکــەی هــەزار لاپەڕەیەو دابەشی یازدە بەش وپێشەکییەك دەبن. ئەم دانراوە لەساڵی (١٢٠٠)ی کۆچی (١٧٨٥-١٧٨٦) ی زایینییەوە باسەکانی دەست پێدەکات، بەڵام زۆر جاریش ئامــاژەی بۆ ڕووداوەکانی پێش ئــەم ســاڵە کــردووە. بــەڵام ئــەوەی جێگــەی پەژارەیــەو زیــانێکی مەزنیشە بۆ کاروانی مێژوونووسی کوردی و نووسینەوەی مێــژووی کــوردو کوردســتان، ئەوەیە کە تائێستا چارەنووسی ئەم کتێبە نازانرێ. ســەرەڕای ئــەوەش دیــارە هــەروەکو دکتۆر کەمال مەزهەر دەڵێت: "بەو نموونە کەمانــەی لەبەردەســتمان دان وادەردەکــەوێ هەستی مێژوونووسی مەلا مەحمودی بایەزیدی قووڵ بووە...".[1]

بەڵام ئەوەی جێگەی دڵخۆشییە ئەوەیە کە بایەزیــدی تــەنیا ئــەو دانــراوەی نــەبووە، بەڵکو کتێبێکی گرنگی تری هەیە کە ئێستا بــە زۆر لەزمانــە زینــدووەکان چــاپکراوە. ئــەویش (عــادات ورســوماتنامەی ئەکرادیــە)، کــە جگــە لەبایــەخی گرنگــی لــەبواری ئەتنۆگرافی ، بایەخێکی مێژوویی بەرچاویشی هەیەو سەرچاوەیەکی ڕەسەنە بۆ مێــژووی ژیانی ئابوری و کۆمەڵایەتی کوردستانی باکور لەسەدەی نۆزدەمدا.[2]

---

(١) کەمال مەزهەر، س . پ، ل١٢٩.

(٢) هـ . س، ل١٣٠-١٣١.

واپێدەچێ بێجگە لەم دانراوە مێژووییانەی ناومان بردن و ناویان دەبەین، زۆر دەستنووسی مێژوویی تریشمان هەبێت کە بەخامەی زاناو ڕۆشنبیرانی کورد نەخشێنرابن بەڵام تا ئێستا نەکەوتبنە بەردەستمان وهیچیان لەبارەوە نەزانین. هەر بۆ نموونە تا ساڵی ١٩٨٥ هیچ زانیارییەکمان لەبارەی ئەم دەستنووسە مێژووییە گرنگە نەبوو کە مامۆستا (مەحمود ئەحمەد محەمەد) لەو ساڵە هەواڵی دۆزینەوەی ڕاگەیاند و دەقەکەی لەگەڵ لێکۆڵینەوەیەکی بەپێزی خۆی لەژێر ناونیشانی (حلقة مفقودة من تأريخ شهرزور/ او مذكرات علماء الدين البلباسيين منذ عام ٥٣٠ الى ١٢٩٠هـ) لەبەشی عەرەبی گۆڤاری (کاروان) بڵاوکردەوە.

ئەم دەستنووسە کە مامۆستای ناوبراو لای مامۆستا مەلا مەحمودی کوڕی مەلا عەبدولڕەحمانی کوڕی مەلا محەمەد سەرگەتی بلْباسی بەردەستی کەوت،[1] بریتییە لەچەند بیرەوەرییەك کە بنەماڵەیەکی ئایینی بلباسی لەسەر قورئانێکی دەستنووس پشت دوای پشت تۆماریان کردووە. سەید ئیبراهیم حوسێنی کەساڵی (٥٣٠ك /١١٣٦ز) لەنووسینەوەی ئەم قورئانە بووەتەوە،[2] دەستیکردووە بەنووسینی بیرەوەرییەکانی لەسەر لاپەڕەیەکی قورئانەکە. دوای ئەویش نەوەکانی کە وەك خۆی مەلا بوون، بەهەمان دەستور کورتەی بیرەوەرییەکانی خۆیان لەسەر هەمان قورئان و دواتر پەڕی تر، بەتێپەڕبوونی کات وسەردەم نووسیوە. لەکۆتاییدا و لەساڵی (١٢٩٠ك / ١٨٧٣ز) مەلا محەمەدی سەرگەتی گوڵعەنبەری، کە لەهەمان بنەماڵەیە، هاتووە ئەو بیرەوەری ویادداشتە مێژووییانەی کۆکردۆتەوەو لەچەند پەڕێکدا نووسیویەتیەوە.

ئەم دەستنووسە بەهەردوو زمانی فارسی وعەرەبی نووسراوەو خاوەن بیرەوەرییەکان زۆر لایەنی ژیانی کوردەواری ئەو سەردەمانەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە. بەتایبەتی لایەنی

---

(١) واپێدەچێ ئەم دەستنووسە ئێستا لەکتێبخانەی ئەوقافی سلێمانی بێت، چونکە مامۆستا مەحمود ئەحمەد محەمەد کە لەساڵی ١٩٨٥ ووتارەکەی بڵاوکردەوە، ئەمینداری گشتی ئەو کتێبخانەیە بوو. هەروەها شوێنی هەڵگیرانی دەستنووسەکەی دیاری نەکرد.

(٢) ئەم قورئانە ئێستا لە (المؤسسة العامة للآثار والتراث) لە بەغدا لە ژێر ژمارە (١٦٤٢٥) داندراوە. بڕوانە: محمود احمد محمد، حلقة مفقودة من تأريخ شهرزور/ أو مذكرات علماء الدين البلباسيين منذ عام ٥٣٠ الى ١٢٩٠هـ، مجلة (كاروان) عدد (٣٦) ايلول ١٩٨٥، ص١٣٨.

زانستی. هەروەها زانیاریووردمان لەسەر هەندێ ڕووداوی مێــژوویی پێدەبەخشــن. بــۆ نموونە دەستنووسەکە زۆر بەووردی و بەدرێژی باسی هۆیەکان وڕووداوی کوشتنی سلێمان پاشای دووەمی بابان دەکات، کە لەساڵی (١١٧٨ك / ١٧٦٥ز) بەدەستی (فەقێ بــرایم) ناوێك کوژراوە. لەکاتێکدا سەرچاوە مێژووییــەکانی تــر زانیــاری کــەمیان لەســەر ئــەم ڕووداوە بۆ تۆمار کردووین.[1]

هەر سەبارەت بەو جۆرە دەستنووسانە، بەپێویستی دەزانین ناوی دەستنووســێکی تــر بهێنین کە لەکتێبخانەی مۆزەخانەی عیراقی لەژێر ژمارە (ح٤٤٦٠) دانراوە. هەرچــەندە ئەم دەستنووسە بۆ مێژووی کــورد تــەرخان نــەکراوە، بــەڵام بایەخەکــەی لەوەدایــە کــە بەرهەمی خامەی نووسەرێکی کوردە، ئەویش (یەحیا نەزیر قۆچ بەگ زادەی ڕەوانــدزی) یە، کە لە دەوروبەری ساڵی ١٨٦٠ ز مــردووە. (یــەحیا نــەزیر) دانراوەکــەی بــەزمانی عەرەبی بەناوی (تاريخ السلطان الغازي) نووسیوەو باس لەمێژووی شــەڕەکانی عوسمــانی ومێژووی عیراقی عوسمانی بەتایبەتی دەکات.[2]

بێجگە لەو نووسراوە ناوبراوانە، لەکوردستانی عوسمانی تا تەواوبوونی سەدەی نــۆزدە چــاومان بــەهیچ هــەوڵێکی تــری مێژوونووســی کــوردی ناکــەوێ. جگــە لەڕۆژنامــەی (کوردستان) کە لە (٢٢)ی نیسانی ١٨٩٨ دەســتی بەدەرچــوون کــردو چــەندین بابــەتی لەسەر مێژووی کورد یا مێژووی گشتی لەژمارەکانی بڵاوکردەوە.

لەنێو بابەتە مێژووییەکانی ئەم ڕۆژنامەیە پێویستە ناوی ئــەم زنجیرەیــە ببــەین کــە (عەبدولڕەحمان بەگ بەدرخان پاشا) لەژێر ناوی (حکامێن جزیره ابن عمر) بەشــێوەزاری کرمانجی ژووروو بڵاویدەکردەوەو باسی مێــژووی میرنشــینی بۆتــانی دەکــرد.[3] کەچــی لەبەشەکەی تری کوردستان (ڕۆژهەڵات) پێش تــەواوبوونی ســەدەی نــۆزدە دوو دانــراوی مێژوویی ترمان بۆ بەجێماوە.

---

(١) م . ن، ص١٣٨ ومابعدها.

(٢) د.عماد عبدالسلام رؤوف، التأريخ والمؤرخون العراقيون، ص٢٤٣.

(٣) بڕوانە: ڕۆژنامەی (کوردستان) ژمارە (٨-١٤) ساڵانی ١٨٩٨-١٩٠٠، لە: (کوردستان) یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی، کۆکردنەوەی: د.کەمال فواد، بەغدا ١٩٧٢.

لەم سالآنەی دوایی لەکتێبخانەی (ملی ملك) لـەتاران دەستنووسـێك بـەناوی (سـیر الاکراد) دۆزرایەوە، کە لە (٢١٤) لاپەڕەی پازدە دێری پێکهاتووەو لەسـاڵی (١٢٨٨ك/١٨٧١ز) بەپێنووسـی (عبـدالقادر ابـن رسـتم بابـانی) بـەزمانی فارسـی نووسـراوە. دەستنووسەکە لەلایەن (محەمەد رەئوف تەوەکوللی) ساغکرایەوەو پێشـەکی و پـەراوێزی بۆ نووسراو لەسـاڵی (١٣٦٦هـەتاوی) لـەتاران بڵاوکرایـەوە.[١] لـەم سـالآنەی دوایـیش لەلایەن مامۆسـتا (کـەریمی حیسـامی) وەرگێڕدرایـە سـەر زمـانی شـیرینی کـوردی و لەووڵاتی سوید بڵاوکرایەوە.[٢]

هیچ لەبارەی دانـەری دەستنووسـەکە نـازانرێ ئـەوە نـەبێ کـە لەبنەماڵـەی بابانـە هەروەکو لەناوەکەی ڕادیارە. بەڵام (ڤاسیلیەڤا) دەڵێت ئەو لەشاری سـنە دانیشـتووە.[٣] (سیر الاکراد) یان (رەوشی کوردان) باس لە مێـژووی ئـەردەلان وبابـان وسـۆران وچـەند ڕووداوێکی تر دەکات. نووسەر لەگێڕانەوەی ڕووداوە کۆنەکان زۆر خێرایە و تەنانەت زۆر بەکەمیش ساڵەکان دیاری دەکات. بۆ نموونە لەباسی سەردەمی سەلیم پاشـای یەکـەمی بابان (چارەگی دووەمی سەدەی هـەژدە)، کـە سـەردەمێکی پـڕ ڕووداوە، تـەنیا باسـی کەسێتی وخووڕەوشتی سەلیم دەکات و هیچی ترنا. دیارە هۆیەکەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە سەرچاوەی پێویستی بۆ ئەو سەردەمانە دەست نەکەوتووە. بۆیە ڕێـی تێدەچـێت کـە بەزۆری پشتی بەگێڕانەوەی دەماودەم بەسـتبێت . بـەڵام کـە دێتـە سـەر ڕووداوەکـانی سەدەی نۆزدە بەتایبەتی لەدوای سییەکان، ئیتر ڕووداوەکان زۆر بەدرێژی و بەووردی باس دەکات. بێگومان ئەوەش لەبەر ئەوەیە خۆی هاوچەرخی ئەم ڕووداوانەیە. دیارە ئەمەش گرنگی وبایەخی کتێبەکە بەدیار دەخات. ئـەو بایەخـە زۆر زیـاتر دەبێـت کـە دەبیـنین هەندێك ڕووداو کە لەسەرچاوەکانی تر کەمیان لەسەر زانراوەو نووسـراوە، ئـەو زانیـاری زۆر وتەنانەت دەگمەنی لەسەریان تۆمار کردووە. وەکو باسـکردنی چارەنووسـی محەمـەد

(١) بڕوانە: عبدالقادر ابن رستم بابانی، سیر الاکراد ، بکوشش: محمد رئوف توکلی، چاپ اول ، چاپخانه ارژنگ، تهران، تابستان ١٣٦٦هـ . ش.

(٢) بڕوانە: عبدالقادر کوڕی ڕۆستەمی بابان، رەوشی کوردان/ مێژووی کوردستان، و:کەریمی حیسامی، چ١، ناوەندی چاپ و ڕازاندنەوەی مەنسوور، سوید ١٩٩٩.

(٣) ی. ئی. ڤاسیلیەڤا، س . پ، ل٢٢.

پاشای سۆران دوای ڕۆیشتنی بۆ ئەستانبۆل، هەروەها هەوڵدانی عەزیز بەگی بابان بۆ گێڕانەوەی حوکمی بابان لەسلێمانی دوای سەپاندنی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی عوسمانی بەسەریدا لەساڵی (١٨٤٩) دا.[١]

دانراوی دووەم (حدیقه ناصریه در جغرافیا وتاریخ کردستان)ی (میرزا عەلی ئەکبەرخان سادق ئەلمولك-ناسراو بە: وەقائیع نگار کوردستانی)یە. کە لەبنەماڵەی ئەردەلانە و ئامۆزای (ماهشەرەفخانم مەستورەی کوردستانی)یە. ئەم دانراوە لەساڵی ١٣٠٩ك /١٨٩١ز بەزمانی فارسی نووسراوە.[٢] تا ئێستا چوار دانە لەدەستنووسی ئەم کتێبە لەبەردەستدایە کە هەرە نوێیەکەیان هی کتێبخانەی (مینۆرسکی) یەو بەناوی ئەوەوە لە (لینینگراد) لە (پەیمانگای ڕۆژهەڵاتناسی) پارێزراوە.[٣] خۆشبەختانە دەستنووسی ئەم دانراوەش لەلایەن مامۆستا (محەمەد رەئوف تەوەکوللی) ساغکرایەوەو لەساڵی (١٣٦٤هەتاوی) بڵاوکرایەوە.[٤] دیارە لەم ساڵانەی دواییش کراوەتە عەرەبی ولە لایەن (دەزگای ئاراس) بڵاوکراوەتەوە.[٥] گرنگی (حدیقه ناصریه) لەوەدایە کە تیشکێکی ڕوونی خستۆتە سەر بارودۆخی مێژوویی وجوگرافی ئەردەلان بەگشتی و(سنە)ی پایتەخت بەتایبەتی. ئیتر ناوچەو ڕووبارو چیا و خێڵەکان وتەنانەت بنەماڵە دیارەکانی ئەردەلانیشی بەباشی باسکردووە.

---

(١) بڕوانە: عبدالقادر ابن رستم بابانی، م .پ، ص١٦٩-١٧١، ١٨٢-١٨٩.

(٢) نەوشیروان مستەفا ئەمین، س . پ، ل١٣.

(٣) ی. ئی. ڤاسیلیەڤا، س . پ، ل٢٠.

(٤) بڕوانە: علی اکبر وقائع نگار کردستانی، حدیقه ناصریه در جغرافیا وتاریخ کردستان، تصحیح: محمد رئوف توکلی، چاپ اول، چاپخانه ارژنگ، تهران ١٣٦٤ هـ.ش.

(٥) بڕوانە: علي اکبر کردستاني، الحديقة الناصرية في تاريخ وجغرافيا کردستان، ت: جان دوست، منشورات دار ئاراس، مطبعة وزارة التربية، اربيل ٢٠٠٢.

جێگەی سەرنجە، عەلی ئەکبەر کوردستانی لەم کتێبەی خۆیدا چەند جارێ ناوی کتێبێکی تری خۆی ئەبات کە بەناونیشانی (تاریخ الاکراد)ـە،[1] بەڵام زانیاری ئەوتۆمان لەبارەیەوە نیە.

لەکۆتاییدا پێویستە ئەوە بگوترێ کە هەموو ئەو بەشدارییە کوردییانە لەبواری مێژوونووسی کە باسکران (بێجگە لەوتارە مێژووییە کوردیەکەی عەبدولڕەحمان بەدرخان لە ڕۆژنامەی کوردستان، کە ئەویش لەدوا ساڵەکانی ئەم چوار سەدەیەیە کە باسەکەی ئێمە دەیانگرێتەوە)، هیچیان بەزمانی زگماکی نووسەرەکان (واتە کوردی) نەنووسراون.[2] بەڵکو زۆربەیان بەفارسی و هەندێکیان بە عەرەبی و کەمێکیشیان بەتورکی دانراون. بێگومان هۆکاری ئەمەش زانراوە، ئەویش ئەوەیە کە ئەو زمانانەی دوایی بەتایبەتی فارسی، لەهەموو ئەم ماوەیەدا زمانی ئەدەب و نووسین بوون لەهەموو ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. بەپێچەوانەی زمانی کوردی کە بێجگە لەشیعرو ئەدەب لەهیچ بوارێکی تری نووسینی ئەو سەردەمە بەکارنەهاتووە. چونکە بەزمانی نووسین لەقەڵەم نەدەدرا. بۆیە زانا و نووسەر وخوێندەوارە کوردەکان دەبووایە هەرسێ زمانی فارسی و عەرەبی و تورکی یان بەلای کەمەوە یەکێکیان بزانن.

سەرەڕای ئەمەش دەبێ بزانین کە ئەم مەسەلەیە بەهیچ جۆرێك لەڕۆڵ وبەشداری کورد لەبواری مێژوونووسین کەم ناکاتەوە، چونکە مێژوو زانستە نەك ئەدەب. هەربۆیە تا ئێستاش زۆر لەمێژوونووسانی کورد، تەنانەت مێژوونووسە بەناوبانگەکانیش، بێجگە لەکوردی بەزمانی تریش دەنووسن.

---

(١) نەوشیروان مستەفا ئەمین، س . پ، ل١٣.

(٢) یەکەم کتێبی مێژوویی کوردی لەساڵی ١٩٢٥ هاتەبەرهەم کە (غنچەی بهارستان)ی مامۆستا حوسێن حوزنی موکریانییە. بڕوانە: کەمال مەزهەر، س . پ، ل١٦٩.

## سەرچاوەکانی باسی سێیەم

**یەکەم: کتێب:-**

**أ- بەزمانی کوردی:**

- ئەنوەر سولتانی، دوو زەیلی شەرەفنامەی بتلیسیی، بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی ۲۰۰٥.

- ئیبنو ئەزرەقی فارقی، مێژووی میافارقین وئامەد، ساغکردنەوەی: د.بدوي عبداللطيف عوض، و: د.قادر محەمەد پشدەری و بورهان محەمەد، چاپخانەی منارە، هەولێر ۲۰۰۷.

- حوسێن حوزنی موکریانی، مێژووی میرانی سۆران، چ۲، هەولێر ۱۹٦۲.

- شەرەفخانی بەتلیسی، شەرەفنامە، و: هەژار،بەغدا ۱۹۷۳.

- عبدالقادر کوڕی ڕۆستەمی بابان، ڕەوشی کوردان/ مێژووی کوردستان، و:کەریمی حیسامی، چ۱، ناوەندی چاپ و ڕازاندنەوەی مەنسوور، سوید ۱۹۹۹.

- د.کەمال مەزهەر ئەحمەد، مێژوو، بەغدا ۱۹۸۳.

- (کوردستان) یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی، کۆکردنەوەی: د.کەمال فواد، بەغدا ۱۹۷۲.

- ماهشەرەفخانم مەستوورەی کوردستانی: مێژووی ئەردەلان، و: د. حسن جاف و شکور مستەفا، چ۱، بەغدا ۱۹۸۹.

- مەستورەی کوردستانی، مێژووی ئەردەلان، و: هەژار، چ۲، دەزگای ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر ۲۰۰٥.

- محمد بایراقدار، ئیدریسی بدلیسی، و: شکور مستەفا، چ۱، کوردستان ۱۹۹۹.

- محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی، فەرمانڕەوایانی موکریان، بەغدا، ۱۹۹۲.

- نەوشیروان مستەفا ئەمین، لەپەراوێزی مێژووی ئەردەلان دا، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپخانەی ئۆفسێتی بابان، سلێمانی ۱۹۹۹.

- ی. ئی. ڤاسیلیەڤا، کوردستانی خوارووی ڕۆژهەڵات لەسەدەی حەڤدەوە تا سەرەتای سەدەی نۆزدە (کورتەیەکی مێژووی میرنشینانی ئەردەلان وبابان)- موسکۆ ١٩٩١، و: د. ڕەشاد میران، هەولێر ١٩٩٧.

**ب- بەزمانی عەرەبی:**

- أنور المايي، الاكراد في بهدينان،ط٢، دهوك ١٩٩٩.
- رحلة طه الكردي الباليساني في العراق وبلاد الشام والاناضول ومصر والحجاز، مقتبسات حققها وعلق عليها: الدكتور عماد عبدالسلام رؤوف، ط١،دار الثقافة والنشر الكردية، بغداد ٢٠٠٢. ط٢، مؤسسة موكرياني للبحوث والنشر، اربيل ٢٠٠٧.
- د. سعدي عثمان هروتي، كوردستان والامبراطورية العثمانية/ دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان (١٥١٤-١٨٥١)، مؤسسة موكرياني- اربيل، مطبعة خاني، دهوك ٢٠٠٨.
- شرفخان البدليسي، الشرفنامه، ت:ملاجميل بندي الروزبياني، ط١، بغداد ١٩٥٣.
- عبدالكريم المدرس، علماؤنا في خدمة العلم والدين، بغداد ١٩٨٣.
- علي اكبر كردستاني، الحديقة الناصرية في تاريخ وجغرافيا كردستان، ت: جان دوست، منشورات دار ئاراس، مطبعة وزارة التربية، اربيل ٢٠٠٢.
- د.عماد عبدالسلام رؤوف، التأريخ والمؤرخون العراقيون في العهد العثماني، ط١، بغداد.
- د. عماد عبدالسلام رؤوف (دراسة وتحقيق)، الشجرة الزيوكية/ وثيقة نسب امراء بهدينان وتأريخهم، مكتب التفسير للنشر والاعلان، اربيل ٢٠٠٩.
- كاوة فريق احمد شاولي ئاميدي، امارة بادينان ١٧٠٠-١٨٤٢/دراسة سياسية اجتماعية ثقافية،منشورات مؤسسة موكرياني/ اربيل،مطبعة خبات- دهوك ٢٠٠٠.
- كوركيس عواد، ماضي الاكراد وحاضرهم في المصادر العربية القديمة والحديثة.
- مذكرات مأمون بك بن بيكة بك، ت: محمد جميل الروزبياني و شكور مصطفى، مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد ١٩٨٣.

**ج- بەزمانی فارسی:**

- عبدالرزاق بيك دنبلى، تجربة الاحرار وتسلية الابرار، تصحيح: حسن قاضي طباطبائي، انتشارات مؤسسة تاريخ وفرهنك ايران/ دانشگاه تبريز، چاپخانه شفق، تبريز ١٣٤٩ش.

- عبدالقادر ابن رستم بابانى، سير الاكراد ، بكوشش: محمد رئوف توكلى، چاپ اول ، چاپخانه ارژنگ، تهران، تابستان ١٣٦٦هـ . ش.

- على اكبر وقائع نگار كردستانى، حديقه ناصريه در جغرافيا وتاريخ كردستان، تصحيح: محمد رؤوف توكلى، چاپ اول، چاپخانه ارژنگ، تهران ١٣٦٤ هـ.ش.

**دووەم: ئینسایكلۆپیدیا:-**

- دائرة المعارف الاسلامية، (الترجمة العربية) اعداد وتحرير: ابراهيم زكي وأحمد الشنتناوى و د. عبدالحميد يونس، القاهرة(د.ت)،مج٦، مادة: ادريس البدليسي (المقال الثاني- ميناج).

**سێیەم: ووتار وتوێژینەوە:-**

- بهزاد شرفخان، حول المصادر التأريخية المؤلفة خصيصاً لتأريخ الكور وكوردستان خلال العصور الوسطى، گۆڤارى (شانەدەر) ژمارە (٢) حوزەيران ١٩٩٧.

- محمود احمد محمد، حلقة مفقودة من تأريخ شهرزور/ أو مذكرات علماء الدين البلباسيين منذ عام ٥٣٠ الى ١٢٩٠هـ، مجلة (كاروان) عدد (٣٦) ايلول ١٩٨٥.

## گەشتی دکتۆر ئیڤز بە کوردستاندا لەساڵی ١٧٥٨ ز دا*

### پێشەکی:

وەرگێڕو نووسەری بەتوانای عیراقی (جعفر الخیاط) باسێکی لەژێر ناوی "مشاهدات الدکتور ایفز بین بغداد وکرکوك والموصل" لەگۆڤاری (الاقلام) ی بەغدایی بەشی (١٢) ساڵی دووەم (ئابی ١٩٦٦) بڵاوکردۆتەوە. باسەکەش بریتییە لەپوختەی عەرەبی بەشێکی گەشتنامەی گەڕیدەیەکی بیانی بەناوی (دکتۆر ئیڤز)، کە لەبنەڕەتدا بەزمانی ئینگلیزی بڵاوکراوەتەوە. لەبەرئەوەی ئەم باسە هەندێ زانیاری بەپێزمان سەبارەت بەماوەیەکی گرنگی مێژووی کوردستان (سەدەی حەڤدەم) دەداتێ، بۆیە بەپێویستمان زانی بەدەقی خۆی بیکەینە کوردی وسەرلەنوێ بڵاوی بکەینەوە. بەڵام لەهەندێ شوێندا پەراوێزمان بۆ زیادکردووە بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی هەندێ زاراوەو خستنەڕووی چەند سەرنجێکی پێویست.

### دەقی باسەکە:

لەرۆژی (١٨) ی حوزەیرانی ساڵی ١٧٥٨ دکتۆر ئیڤز لەبەغدا بەرەو ئەوروپا بەڕێ کەوت بە ڕێگای موسل ـ ماردین ـ دیاربەکر ئینجا حەلەب. بۆ کۆتایی هێنان بە گەشتەکەی. پێشتریش خۆی و هاوەڵەکانی چادرو کەژاوەو کەلوپەلەکانیان بەڕێ کردبوو. کاتێك دەستیان بەجولە کرد لەو ڕێگایەی کە لە باکووری بەغدا و ئەعزەمییەوە دەستپێدەکات، بینییان وا چادرەکانیان لەکەناری ڕۆژهەڵاتی دیجلە لە بەرامبەر کۆشکی لادێیی پاشا[1] هەڵدراوە، کە ماوەی میلێك لە شورەی شارەکە دوورە. تا ئەو قۆناغەی

* ئەم باسە لەژمارە (١١٩) ی گۆڤاری (مەتین) بڵاوکراوەتەوە، کە لەکانونی یەکەمی ٢٠٠١ لەدهۆك دەرچووە.

**تێبینی:** جگە لەپەراوێزەکانی ژمارە (٣) و (١٧) کە نووسەر دایناون، هەموو پەراوێزەکانی تر هی وەرگێڕن.

(١) لەئیمپراتۆریای عوسمانیدا، پیاوانی دەولەت بەهۆی نیشانەیەك کە پێی دەگوترا (تەوغ)، پلەوپایەیان دیاری دەکرا. ئەوانەی ئیالەت (یان: ویلایەت) یان بەڕێوە دەبرد (٢ یان ٣) تەوغیان هەبوو بەپێی بایەخی

ڕێگا کەسانێك بۆ بەرێکردن لەگەڵیان هاتبوون، دیارترینیان مستەر گاردنی کۆنسۆلی بریتانی و قەشە ڤیدلی ئەسقوفی بابلی فەرەنسایی بوون لە بەغدا. ئەمەی دوایی سێ نامەی دابووە ئیڤز: یەکەمیان بۆ باوکە لانزای مژدەدەری ئیتالیایی لە موسڵ، دوومیان بۆ باوکە یۆجینی مژدەدەری فەرەنسایی لە ماردین ، سێیەمیشیان بۆ تۆمای کۆنسۆلی فەرەنسی لە حەلەب. هەر بۆ بەرێکردن خواجە ڕۆفائیلیش هاتبووە دەر، کەبازرگانێکی ئەرمەنی بوو. بە گوتەی دکتۆر ئیڤز ئەم خواجەیە ماوەیەك لەمەوبەر لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە هاورەگەزانی خۆی لەئێرانەوە بۆ شاری بەغدا کۆچیان کردبوو.

هەر ئەم خواجە ڕۆفائیلە کاروباری کاروانەکەی ڕێکخستبوو کە لە (٣٠) هێستر پێکدەهات بۆ سواربوون و هەڵگرتنی کەلوپەلەکان. لەبەرامبەر ئەمەش سەرۆکی کاروانەکە (٤٥) قرش[1] بۆ هەر هێسترێك وەردەگرێت، بەمەرجێك خۆیان و بارەکانیان بگەیەنێتە حەلەب. هەر هێسترێکیش لەڕێگادا پەکی کەوت بە یەکێکی تر بیگۆڕێتەوە. بەڵام دەبێ ئالیکی ولاغەکان لە سەر حسێبی ئەوان بێت. سبارەت بە جلەوکێش (السایس) و کەژاوەچی و پیاوەکانیش، ئەوا لەسەر ڕێبوارەکان پێویست بوو لە حەلەب (٢٥) قرش بدەنە ئەوەی یەکەم و (٦٠) زێڕ مەحبوبیش[2] بۆ دووەم و حەفت پیاوەکەی.

---

ئیالەتەکە. ئەمەش مافی ئەوەی پێدەدان نازناوی پاشا هەڵبگرن. (تەوغ)یش بریتی بوو لەگورزێك داوی کلکی ئەسپ کە لەسەر لوتکەی ئاڵا یەك شۆڕ دەکرایەوە. مەبەستی ئیڤز لە ووشەی پاشا لێرە سلێمان پاشا ئەبولەیلەی والی بەغدایە کە لەنێوان ساڵانی ١٧٤٩-١٧٦٢ز حوکمڕانی کردووە. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەو پلەوپایانە بڕوانە: هاملتون جیب و هارولد بوین، المجتمع الاسلامي والغرب، ت: عبدالمجید القیسي، ج١، ق١، ط١، دمشق ١٩٩٧، ص١٨٤-١٨٥.

(١) قرش: دراوێکی زیوی عوسمانی بوو کەبۆ یەکەم جار لەساڵی ١٠٩٩ك/ ١٦٨٨ز لێدرا. سەرەتا کێشی (٦) درهەم بوو (هەر درهەمێکیش نزیکەی سێ گرام دەبوو) بەڵام دواتر کێش ونرخی لەبەرامبەر دراوەکانی تر گۆڕانی زۆری بەسەرداهات. شایانی باسە قرش لای ئەوروپییەکان بە (پیاستەر) دەناسرا. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عباس العزاوي تاریخ النقود العراقیة لما بعد العهود العباسیة، بغداد ١٩٥٨، ص١٤٢.

(٢) واتە زێڕی خۆشەویست، بەپێی کتێبی (تاریخ النقود العراقیة)ی (عباس العزاوي) ئەمە دیناری عوسمانی ئەو کاتە بوو. بەڵام دیارە ئەو بڕە پارەیە لەچاو ئاستی کرێی ئەو سەردەمە زۆرە، وەك لەو گەشتەدا تێبینی دەکرێ.

خواجە ڕۆفائیلیش ڕایسپاردبوون کە لەڕێگادا چادرێکی تایبەت بۆ محەمەد ئاغا تـەرخان بکەن، کە بۆ پاراستنی کاروانەکەو ئاگاداربوونی ببووە هاوەڵیان.

تائێوارەی ڕۆژی دووەم لەو چادرگەیە مانـەوە ئنجـا گلێـان دایـەوەو بـەرەو بـاکوور بزواتن. بەڵام لە بەیانییەکەی ئەم ڕۆژە (دووشەم) گەشتێکیان بەنێو ڕەزی پاشـا دا کـرد کە دەوری کۆشکەکەی دابوو. دکتۆر ئیڤز و هاوەڵەکانی لەو ڕەزەدا بڕێکـی زۆر میـوەو بەروبوومیان بینی: وەك ترێی سپی و ڕەش کە لەکاتی پێگەیشتن دابـوو، تـوو لـەجۆری ئەورووپی کە لەموسڵەوە هێنرابوو، هەروەها قەیسی و هەڵووژەو خۆخ کە هێشـتا تـەواو پێنەگەیشتبوون. ئنجا سێو و باوی کە بە گووتەی ئیڤز لێرە لەوەرزی ئاساییدا دەگەنـە ئاستی پێگەیشتن. بەڵام بەری بەهیٚ و هەنجیر و هەنار هێشـتا کـاڵ (کـارك) بـوون. لـە کاتێکدا گندۆرەی بچووك و ئاروو(خیار) لەو وەرزەدا پێگەیشتبوون. هـەروەها تێبینـی هەندیٚ داری زەیتون وجورێکی گەورەی توویان کرد.

محمد ئاغا کە بۆ پاراستنی کاروانەکە لەگەڵیان نێردرابـوو، ڕاسـپاردەی تایبـەتی لـە سلێمان پاشاوە پێبوو بۆ سەرداران و گەورە بەرپرسانی ئەو هەرێمانـەی دەکەوتنـە سـەر ڕێگای نێوان بەغدا و حەلەب، هەروەها چوار نووسراوی لەم جۆرەی بۆ پاشاکانی موسـڵ ودیاربەکر وئۆرفە و حەلەب هەڵگرتبوو، جگە لە چوار نامـەی تـر لـە عبداللـە ئاغـای کەهیەوە[1] بۆ کەهیەکانی چوار پاشا ناوبراوەکە. نووسراوەکانی پاشاکان لە جۆرکی سپی دابوون، بەڵام هی کەهیەکان لە جۆرکی ڕەنـگ سـوور. دکتـۆر ئیڤـزیش بـەڵێنی دابـوو دیاریەکی باش کە (٥٠٠ ) قرشە بداتە محمد ئاغا کاتیٚ لـە حەلـەب لێـی جیادەبنـەوە، ئەگەر بە باشی لەگەڵیاندا بجولێتەوە.

دکتۆر ئیڤز دەڵیٚ ئەگەر ئەوان لە خزمەتکارانی خاوەن شکۆی بەریتانیا[2] نەبوونایـە بەم شێوەیە بەباشی و بەڕێزەوە مامەڵەیان لەگەڵ نەدەکرا، و ڕێگـەیان پـیٚ نـەدەدرا لـە گەشتەکەیاندا کەژاوە بەکاربێنن. یان ئەو گۆیە ئاو زێڕکراوە لەسـەر چـادرەکەیان بـەرز بکەنەوە، چونکە تەنیا پاشا مافی ئەمەی هەبوو. ئەوە بوو کاتێك لە نزیك کۆشکی پاشا

---

(١) کەهیە: کەتخودا و کێخواشی پێدەگوترا، پایەیەکی کارگێڕی عوسمانی بوو وەك یارمەتیـدەر یـان جێگـری والی وابوو.

(٢) مەبەستی هاونیشتیمانییانی وڵاتی بەریتانیایە.

هەڵیاندابوو ئەم گۆیەشیان بەرز کردبۆوە، پاشا لە کۆشکەکەی خۆیەوە تێبینی کرد وبە سەرسامییەوە پرسیاری لە بارەی کرد. بەڵام کاتێ تێیانگەیاند کە ئەمە چادرگەی گەشتیارانی ئینگلیزە، پیاوەکانی ڕاسپارد کە هەقیان بە سەریانەوە نەبێت، ئەمەش بووە هاندەری بەردەوام بوونیان لەسەر ئەمە.

دوای دوو کاتژمێر ڕۆیشتن بە ڕێگەدا ئەو خەندەك و قوللانەیان بینی کە نادر قولی خان (نادرشا)[1] لە کاتی ئابلوقەدانی بەغدا لە سەردەمی ئەحمەد پاشای[2] والی پێشوو دایمەزراندبوو، بۆ ئەوەی تەوقێکی توند بۆ ماوەی حەفت مانگ بەدەوری ئەو شارەدا بسەپێنێ.[3] یازدە قوللە بە وێرانی بینران کە بەخشت دروست کرابوون و لە هەموو لایەکەوە دەلاقەیان هەبوو بۆ ئەوەی سەربازان تفەنگ هاوێژی تێدا بکەن. هەریەك لەم قوللانە بە ئەندازەی (٥٠٠) یاردە[4] لەوی تر دوور بوو. دوای بەردەوامبوون لەڕۆیشتن لە سەعات دوو و نیوی دوای نیوەشەو گەیشتنە گوندی (یەنکیجە) یان گوندی نوێ کە تائێستا[5] لە شوێنی خۆی ماوە. ئنجا دوای سەعاتێك ڕۆیشتنی تر بە ناو پەرێزی گەنمدا چوونە (دەوخەڵە) کە تا ئێوارەی ڕۆژی دواتر تیایدا مانەوە. دکتۆر ئیڤز دەڵێ

---

(١) نادرشا: لە کەسایەتییە مێژووییە دیارەکانی ئێران وناوچەکەیە بەگشتی. لەساڵی ١٧٣٠ ئێرانی لەداگیرکاری ئەفغانیەکان ڕزگار کرد و دواتر چەندین فراوانخوازی لەووڵاتانی دەوروبەر ئەنجامدا. لەساڵی ١٧٣٦ تاجی شاهێتی لەسەرنا و بنەماڵەی دەسەڵاتداری ئەفشاری دامەزراند. لەساڵی ١٧٤٧ دا کوژرا. لەبارەی ژیان وسەردەمی نادرشا بڕوانە:

Lokhart, Nadir Shah, London 1938.

(٢) ئەحمەد پاشا: یەکێکە لەوالییە بەتوانا وناسراوەکانی بەغدا لەسەردەمی عوسمانی کە لەنێوان ساڵانی ١٧٢٣-١٧٤٧ حوکمڕانی ئەم ئیالەتەی کرد. لەبارەی سەردەمی ئەم والییە بڕوانە: علي شاكر علي، تأريخ العراق في العهد العثماني، بغداد ١٩٨٤، ص١١٣و دواتر.

(٣) بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: د. علاء نورس، العراق في العهد العثماني/ دراسة في العلاقات السياسية ١٧٠٠-١٨٠٠، بغداد ١٩٧٩، ص١٥٤-١٧٩.

(٤) یەك یاردە دەکاتە سێ پێ (قدم- فووت).

(٥) ووشەی ئێستا واتە ساڵی ١٩٦٦.

ژمارەیەکی زۆر لە ڕەزو باخ دەوری ئەم دوو گوندەیان دابوو کە لەهەموو وەرزەکاندا سەوزە و میوەیان بۆ بەغدا دابین دەکرد.

لە دەوروبەری حەفتی ئێوارەی ڕۆژی دواتر کاروانەکە بە ئاراستەی ڕۆژهەلاّت جوولّەی کردو لەسەر ئەم ئاراستەیە بەردەوام بوو بۆ ماوەی سەعات و نیوێك تا گەیشتە چەمێك یان ڕووبارێکی بچووك کە دەڕژێتە دیجلەوە. بەهۆی پردێك کە لەسەری دانرابوو توانییان بپەڕنەوە ئەودیوی ڕووبارەکە کەلەوانەیە ڕووباری خالیس بێت. لێرەوە ئاراستەی گۆڕا بۆ باکوور، لەڕێگادا ڕێکەوتی خەلکێکی زۆریان کرد کە بەرەو بەغدا دەچوون. لەنێو ئەوانە تێبینی کاروانێکی گەورەیان کرد کە لە نزیکەی (٣٠٠) وولاّغ پێکدەهات. ئەم وولاّغانە کەبریتیبوون لە هێستر و حوشتر و کەر، (کا) یان بۆ ئاخوڕەکانی پاشای بەغدا بارکردبوو. کاروانەکەی ئیڤز تا سەعات یەکی دوای نیوەشەو لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو ئنجا گەیشتە ( خان مصباح ) کە کاروانسەرایەك بوو تا ئێوارەی ڕۆژی دواتر تیایدا حەوانەوە. لەو کاروانسەرایە دوو کاروانی بچووکیان بینی لە ئەستەمبۆلّەوە بەرەو بەغدا دەهاتن. لە نێوانیان تێبینی چەند سوارێکیان کرد کە لە ڕێگادا لە باکووری موسلّ ڕووت کرابوونەوەو بریندار کرابوون.

قۆناغی دواتر کە کاروانەکەی دکتۆر ئیڤز لە شەوی دواتر تیایدا وەستا کاروانسەرای (سەباح) بوو لە نزیك پردی سەباح. ئەو کاروانسەرایە لە تەنیشت بینایە کۆنەکەی سەر لەنوێ بنیادنرابۆوە. دکتۆر ئیڤز دەلّێ ئەو ئاغایەی لە گەلّیاندابوو لێرە بۆ شوێنێکی نزیکی بردن و چیرۆکە بەناوبانگەکەی ئەحمەد پاشاو شێرەکەی بۆگێڕانەوە. گوایا شێرێك بۆ ماوەی سێ سالّ ترسی لەو ناوە دروست کردبوو خەلکەکە لێی تۆقابوون ، ئەحمەد پاشا کە بۆ سەیران هاتبووە ئێرە، ڕێکەوتی ئەو شێرەی کردو ناچار ڕووبەڕووی بۆوە. هەرچەندە ئەسپەکەی ژێری لە دەستدا بەلاّم توانی بە ڕمەکەی شێرەکە بکوژێت. ئەمە لە کاتێکدا گەشتنامەی نیپۆر و سەرچاوە عەرەبی و تورکییەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەو ڕووداوە لەناوچەی (عەقەرقۆف)ی نزیك کازمیە ڕوویداوە کە پاشا زۆر جار بۆ ڕاو دەچووە ئەوێ. هەروەها دەلّێن لەوکاتەدا سلێمان ئاغای لەگەلّدابووە کە لەنزیکترین کۆیلەکانی ئەحمەد پاشا بوو. ئەویش هەمان سلێمان پاشای ئەبولەیلەیە کە دواتر بووە والی بەغدا. واتە لەوکاتەی دکتۆر ئیڤز سەردانی بەغدای کرد. ئەوەی زانراوە سلێمان

ئاغای کۆیلە یارمەتی ئەحمەد پاشا داوە بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو شـێرە. لەپاداشـتی ئـەم کارەش پاشا عادیلە خاتوونی کچە گەورەی خۆی لێ مارەکرد.

دوای هەشت سەعات ڕۆیشتن کاروانەکە گەیشـتە دەللـی عـەباس[1]، لـەوێ لەسـەر پردێکی بەردین پەڕینەوە کە لەدوو تاق پێکدەهات، ئنجا لە کاروانسـەرایەك بارگـەیان خست. ئـەو ڕۆژەش کـە (٢٢) ی حـوزەیرانی سـاڵی ١٧٥٨ بـوو، بـە بۆچـوونی ئیڤـز گەرمترین ڕۆژ بوو. تەنانەت لە گەرمان هیچ خواردنێکی پێ نەخورا. هەروەها دەڵێت لە دوو قۆناغی دوایی ڕێگا کە ڕێکەوتی چەند شالاوێکی چڕی کۆللۆیان کرد. هەر لە ڕێگا دا بەلای چەندین ڕێبوار تێپەڕین لە نێوانیاندا پاشای کەرکوکی بەدبەخت کە سوڵتان لـە بەر چەند هۆیەك لێی تووڕە ببوو. بۆیە بەرەو بەغدا بارگەی تێکنابوو تا سـلێمان پاشـا چارەی بکات و شەفاعەتی بۆ بخوازێت.

لە گرنگترین ئەو شتانەی لە بارەی ڕێگای نێوان ئەو مەنزڵە و قەرەتەپە باسی دەکات ئەوەیە کە پیاوانی کاروانەکە چەکیان ئامادەکرد و هۆشدارییان وەرگرت نەوەکو لـەکاتی تێپەڕین بە بانی (کەسکەداوەری) تووشی جەردە وڕێگـر بـب. گـەرماش توونـدی کـرد بەجۆرێك دکتۆر ئیڤز دانیشتنی ناو کەژاوەی پە سەند کرد بەسەر سـواری هێسـتر. دوای بڕینی بانەکە بە دەشتێکی کشتوکاڵی بە پیت تێپەڕین کە ڕووباری نارین ئاوی دەدا.

دکتۆر ئیڤز و ڕێبوارەکانی تر بینییان قەرەتەپە شارۆچـکەیەکی لادێیـی جوانـە کـە لەسەر بەرزاییەك بەقوڕ بنیادنراوە، بەڵام شەقامەکانی فراوانتر بوو لەو شـەقامانەی کـە ئیڤز تا ئەو کاتـە لەهـەر شارۆچـکەیەکی تـری تـورکی بینیبـووی. خـەڵکی قەرەتەپـە ئەسمەرتر بوون لە دانیشتوانی بەغدا چونکە ناچار بوون لەو کێڵگەو ڕەزانە کاربکەن کـە لە دەوروبەریان زۆر بوون.[2] لە گەڵ ئەو هەمـوو ڕەزوباخـە زۆرەش کاروانەکـە نـەیتوانی هەندێك میوەی بۆ خواردن دەستکەوێ. لەو شـتە سـەیرانەی لـەو گەشـتەدا لـە بـارەی قەرەتەپە باسدەکرێ هەبوونی ژمارەیەکی زۆری باڵندەی لەق لەقە، کە بە سەدە هایان لێ دەبینرا لەهەر لایەك لەلایەکانی ئەو شارۆچکەیە. لە سەر خانووەکان و لە ڕەز وسەر دار

(١) دەللی عەباس: ئێستا ناوی (المنصورية)ی لێنراوە.

(٢) لەو بڕگەیەدا پچڕپچڕییەك لەنووسین بەدی دەکرێت. بەڵام بۆ پابەند بوون بەدەقەکە بەناچاری وەکـو خـۆی وەرگێردرا.

ودیوارەکان. دیارە ئەو لەق لەقانە هەروەکو ئیڤز دەڵێت هەستیان بەدڵنیاییی دەکرد و لەوێ نەدەترسێنران. لە هەر هێللانەیەك سێ تا چوار بێچووە لەق لەق هەبوون.گەورەکانیشیان دەنگێکی سەیریان هەبوو لەو دەنووکە کە درێژی دەگاتە ٨-٩ بۆسە. شاراوەش نیە کە قەرەتەپە تا ئەمڕۆش لە نێو خەڵکدا بە لەق لەق بەنێوبانگە.

لە دوای قەرەتەپە کاروانەکە لە شارۆچکەی ئاسکی کفری بارگەی خست کە دەکەوێتە سەر گردێکی نزم و ژمارەیەك جۆگەی ئاوی سازگار بەدەوروبەریدا تێدەپەڕێ. بەڵام لێرەش کاروانەکە هیچ میوەیەکی دەست نەکەوت، هەر لە ئاسکی کفری تێبینی ژمارەیەکی یەکجار زۆری شەمشەمەکوێرە کرا.

ئینجا کاروان بەرەو توز خورماتوو بەڕێ کەوت، لە ڕێگادا ڕێکەوتی ژمارەیەکی زۆر کوللۆیان کرد بە جۆرێك وولاغەکان لەڕۆیشتندا بەسەریان دەکەوتن. بەڵام دکتۆر ئیڤز دەڵێ ئەم کوللۆیانە هەرچەندە زۆر بن ناگەن بەوەی کە پێشتر لە مەدغەشقەر بینیبووی. چونکە لەوێ ئەوەندە زۆربوون تەمومژێکیان لە دەوری مرۆڤ دروست دەکرد کەلە دووری سەد یاردە زیاتر نەبینرێ.

توزخورماتوو لە ژمارەیەك خانووی قوڕی چاك پێکدێت، ڕەزەکانیشی بەخشتی قووڕ بەڕێکی پەرژین کراون و بڕێکی زۆر لە خورما و قەیسی و سێوی دەهێنایەبەر. بەڵام سەختی سەرما و بەستەڵەکی زستانی ڕابردوو بووە هۆی لەناوبردنی بڕێکی زۆری تری. لە کاتێکدا لە وەرزی ئاساییدا لێرە ترێیەکی زۆر دێتەبەر و شەرابی نایابی ترێی هەمیشە لێنابڕێ . لەبەیانی ڕۆژی دواتر ڕێبواران بینییان ژمارەیەکی زۆر ئافرەتی توزخورماتوو خەریکن بە گۆزە لە چەمەکانی دامەن چیا نزیکەکان ئاو بۆماڵەکانیان دەهێنن. هەر لەو ڕۆژەدا دکتۆر ئیڤز سەردانی سەرداری ناوچەکەی کرد کە لاوێکی قۆزی تەمەن (٣٠) ساڵەی خزمی پاشای دیار بەکر بوو. هەر لەوێ چاویشی بە سەرکردەی هێزەکانی سەر بە سلێمان پاشا لەو دەڤەرە کەوت. کاتێك ئاغای کاروانەکە لەبارەی ڕێگای کەرکوك پرسیاری لێ کردن گوتیان ئەو ڕێگەیە مەترسیدارە، چونکە پێش چەند ڕۆژێك کۆچەرە عەرەبەکان هێرشیان کردبووە سەر تەتەری پاشای بەغدا و هەشت سواری یاوەری، بۆیە ناچار بوون هێزێکی تایبەت لەگەڵ خۆیان بدەن.

لەگەڵ ئەمەشدا کاروانەکەی ئیڤز بێ مەترسی گەیشتە داقوق، کە بەگوتەی ئیڤز گوندێکی بودەڵەیە و لەسەر گردێك هەڵکەوتووە. خەڵکەکەشی لە سەر پەروەردەکردنی کرمی ئاوریشم (دود القز) و چنینی کوتاڵی ئاوریشم بەڕێوەدەچن کە دەیفرۆشنە بازرگانانی بەغدا وشارەکانی تر. بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە ئیڤز هیچ ئاماژەیەك بۆ ئەو ئارامگەیە ناکات کە ئەمڕۆ بەناوی (امام زین العابدین) ناسراوە، لە کاتێکدا ئێستا و لەمەوبەر داقوق بەو ئارامگەیە ناسراوە. دوای جێهێشتنی ئەو گوندە وتێپەڕین بەلای تازەخورماتوو کاروانەکە لە ڕۆژی (٢٧) ی حوزەیرانی ١٧٥٨ گەیشتە کەرکوك.

لە کەرکوك دکتۆر ئیڤز و هاوەڵەکانی لە خانووێکی نزیك شار دابەزین کە بۆیان ئامادە کرابوو، ئەو خانووە لەوانەیە کەوتبێتە ناوچەی قۆریەی ئێستا چونکە ئەو مەبەستی قەڵای کەرکوکە. ئیڤز دەڵێ ئەو قەڵایە وەك دورگەی لێدێت کاتێك باران دەبارێت و ئاو لە دەوری کۆدەبێتەوە. هەروەها ئاماژە بەو ئابلوقەیە دەکات کە نادر شا (١٥)[1] سال لەمەوبەر سەپاندبوویە سەر ئەو شارە بەر لەوەی داگیری بکات، لە کاتێکدا بەڕێوە بوو بۆ داگیرکردنی موسڵ. ئەو ئابلوقەیە (٢٤) ڕۆژی خایاند و لەو ماوەیەدا دانیشتوان بێ یارمەتی هیچ هێزێکی سەربازی بەرگریان کرد، چونکە پێنج هەزار کەسیان چەکدار بوو. بۆیە دوای چەند مەرجێك ئنجا شارەکەیان دابەدەستەوە، ئەوە بوو لە گیان وماڵیان دڵنیاکران لە بەرامبەر ئەوەی خواردن و ئازوقە بۆ لەشکری ئێران دابین بکەن.

نادر شا سەرەتا پابەندی بەڵێنەکانی بوو، بەڵام کە نەیتوانی موسڵ بگرێت هەرچەندە ئابلۆقەیدا وشورەکانی بەتوندی بۆردومان کرد، ئەو کاتە گەڕایەوە سەر کەرکوك و سەرانەیەکی گەورەی بەسەردانیشتوانەکەیدا سەپاند. کاتێکیش ئەو لەشکرە تورکییەی بۆ ڕزگارکردنی کەرکوك نێردرابوو لەو شارە نزیکبۆوە، نادر شا لێی کشایەوەو لەگەڵ خۆشی ئەوەندەی دەسکەوت و کەل وپەلی دانیشتوان بردبوو کەزێتر بوو لەتوانای هەڵگرتنی، ئەمەش سەرباری ئەو کاڵاو ئازوقەیەی کە لەشکرەکەی پێویستی بوو. بۆیە

(١) لەدەقە عەرەبییەکە (٥٠) ساڵ نووسراوە، بەڵام ڕاستەکەی (١٥) ساڵە چونکە ئەم ڕووداوە لەساڵی ١٧٤٣ ڕوویداوەو گەشتەکەش لەساڵی ١٧٥٨ بوو.

لەشوێنیكی نزیك باشووری كـەركوك بڕێكـی زۆری ئازوقـەو دانەوێڵـە عـەمبار كـرد و شاردیەوە. چونكە نەیتوانی لەگەڵ خۆی هەڵیبگرێ و نەشیدەویسـت بیفـەوتێنێ، بـەڵام هەموو ئەمانە وەكو پارویێكی سانا كەوتنە دەست توركەكان. لەكاتی ئابڵوقەدانی قەڵای كركوك نزیكەی (٥٠٠) كەس لە بەرگریكاران كوژران وخەڵكەكەش تـۆقین و زۆر خـراپ تەنگەتاو كران. گۆڕی حوسێن پاشای سەرداری كەركوكی عوسمانی دەكەوێتە ڕۆژهەڵاتی قەڵاكە، ناوبراو لە شەڕی دەربەند بە گوللەتۆپێكی ئێرانی برینـدار ببـوو، دواتـریش بـە شمشێری سەربازێكی ئێرانی كوژرا كاتێ بە برینداری بینیبـووی. بـەڵام نـادر شـا خـۆی سـزای ئــەو سـەربازەی دا وفەرمانیـدا لــە سـێدارە بـدرێ و لاشـەی حوسـێن پاشـاش بنێردرێتەوە كەركوك بۆئەوەی بەڕێزەوە لە گۆربنرێ. هەموو ئەو ڕوداوانەش پێش داگـیر كردنی شارەكە ڕویاندابوو.[١]

لەو شتانەی ئیڤز لەكاتی مانەوەی لە كەركوك باسی دەكات، هاتنی موتەسەللیم[٢] و فەرماندەی هێزی یەنیچەری (انكشـاری)و سـێ لـە گـەورە ئەفسـەرانە بـۆ ماڵەكـەی. هەروەها دەڵێ ئەو پاشایەی كـەركوك بـەڕێوەدەبات بـەزۆری پاشـای خـاوەن پلـەی دوو تەوغە[٣]، ئەوپاشایەش ئەوكاتە لەوێ نەبوو بۆیە موتەسەللیم لە شـوێنی ئـەو كاروبـار بەڕێوە دەبات.

هەروەها ئیڤز دەڵێ گەورە زانای ئاینی (مەلا) شارەكەش سەردانی كردو ڕایكێشا ناو گفتوگۆیەكی ئاینی درێژ سەبارەت بە ئیسـلام ومەسـیحیەت و بڕوانـەهێنانی فەڵـەكان

---

(١) بۆ زانیاری زیاتر و ووردتر لەبارەی شاڵاوەكانی نادرشا بـۆ سـەر كـەركوك وناوچـەكانی تـری كوردسـتانی باشوور بڕوانە: د. سعدي عثمان حسين، كوردستان الجنوبية في القرنين السـابع عشـر والثـامن عشـر/ دراسـة في علاقاتهـا السياسية و الادارية و الاقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل، اربيل ٢٠٠٦، الفصل الرابع.

(٢) موتەسەللیم: پایەیەكی كارگێڕی عوسمانی بوو، بەو كەسـە دەگـوترا كەشـوێنی والـی دەگرتـەوە لـەكاتی ئامادەنەبوونی لەبەر هەر هۆیەك لەهۆیەكان. بۆیە پێشی دەگوترا (قائممقام). هەروەها بەسەرداری ئـەو شـار وناوچانەش دەگوترا كە سەربە دەسـەڵاتی ناوەنـدی ئیالـەت بـوون. وەك بەسـرا كـە لەسـەردەمی حـوكمڕانی مەمالیكەكان لەبەغدا سەر بەئیالەتی بەغدا بـوو. عبـدالرحمن بـن عبـدالله السـويدي، تـاريخ حـوادث بغـداد والبصرة، تحقيق: د. عماد عبدالسلام رؤوف، بغداد ١٩٧٨، ص٥.

(٣) لەپەراوێزی ژمارە (١) پێناسەی تەوغ كراوە.

(مەسیحیەکان) بە پێغەمبەری ئیسلام محمد (د.خ ). هەروەها پێ گوتووە کە ئارامگـای دانیال پێغەمبەر لە قەڵایە، بۆیـە موتەسـەللیم و سـەرۆکی کاروانەکـە و هاوەڵـەکانی، هاوڕێ لەگەڵ دکتۆر ئیڤز چوون بۆ سەردانی ئەو ئارامگایـەو بینـینی شـتەکانی نـاوی. کاتێك گەیشتنێ و تیایدا گەڕان وسوڕان، منداڵان لێیان کۆبوونەوە تاژمارەیـان بـوو بـە ٣٠٠- ٤٠٠ منداڵ. ئنجا دەستیانکرد بەناڕەحەتکردن و بەرد تێگرتنیان تا موتەسەللیم وئاغا لێیان خوڕینەوە. ئیڤز دەڵێ درێژی ناوچەی قـەڵا دەگاتـە نزیکـەی (٢٥٠) یـاردە وپانییەکەشی نزیکەی (١٢٠) یاردە دەبێ. کەچی بەرزییەکـەی تـا لوتکـەی شـوورەکە نزیکەی (٨٠) پێ دەبێت. چونکە هیچ شوێنەوارێکی قوللـە و تۆپیـان لەقـەڵا نـەبینی، بۆیە ئیڤز باوەڕی وابوو قایمییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ شوێن وبەرزییەکەی، بەجۆرێك تـەنیا بەبەرد وتفەنگ دەتوانرێ بەرگری بکرێ. ئیڤز وهاوەڵەکانی دوودڵ بوون لەچوونە ناو ئەو مزگەوتـەی گـۆڕی دانیـال پێغەمبـەری لێبـوو، هەرچـەندە موتەسـەللیم و مەلاشـیان لەگەڵدابوو. ئەوان لەوە دەترسان ناخۆشییەکیان بێتەڕێ، چـونکە دەیـانزانی موسـڵمانان ڕێگەی کەسانی ناموسڵمان نادەن بچنە ناو مزگەوتەکانیان. بەڵام بەرپرسان تێیانگەیاندن کە ئەو قەدەغەکردنە خەڵکانی وەك ئەوان ناگرێتەوە، چونکە تـەنیا فەلـەکانی خـەڵکی ئەو وولاتە جێی مەبەستن. ئنجا ناوبراوان چوونە ژوورەوە و دوو گۆڕیـان بـینی، یـەکیان هی دانیال پێغەمبەر وئەویتر هی ئیشەعیا بوو بەو پێیەی پێیان گوترا. وەك ڕێزلێنـان و بــەخێرهێنانیش ئیمــامی مزگەوتەکــە هەنــدێ گــوڵاوی پرژانــدە ســەر دەموچــاو و دەستەسڕەکانیان.

ئیڤز دەڵێ مەلایەکە زۆر هەوڵی لەگەڵ لاوێکی هاوەڵیان دا کە ناوی مسـتەر پیگـۆ بوو بۆ ئەوەی ببێ بە موسڵمان، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو.

هەروەها باس لەزۆری باڵندەی لەق لەق دەکات لەکەرکوك، دوای ئەوەی لەقەرەتەپـە لەم بارەیەوە بەدرێژی دوا. ئنجـا دەڵـێ ئـەوان هـەر لـەو کاتـەوەی ناوچـەی فوراتیـان بەجێهێشتبوو گوێبیستی دەنگی باڵندە نەببوون.

بەڵام جێی سەرسامییە کە دەبینین دکتۆر ئیڤز لەگەشـتنامەکەیدا هـیچ ئامـاژە بـۆ هەبوونی نەوت لەناوچەی کەرکوك ناکات ، جگە لەگوتەیەکی سـەرپێیی نامـەفهوم کـە لەکاتێکدا دەیڵێ کە باسی کەرکوك لەگۆڕێدا نیە. ئەمە لەکاتێکدا ژمارەیەك گەڕیـدەی

تر بەتایبەتی کارستن نیپۆر، بەڕوونی باسیان لەو لایەنە کردووە. ئەوەتا نیپۆر کە لەئاداری ساڵی ١٧٦٦- واتە تەنیا هەشت ساڵ دوای ئیڤز- بەناوچەکەدا تێدەپەڕێت، زانیاری زۆر لەبارەی نەوتی کەرکوك تۆمار دەکات و دەڵێت: "لەتوزخورماتووی نزیك یەنکیجە خوێ وقیر و کانی نەوت زۆرن، بەڵام خەڵك بایەخ بەقیری ئەو ناوچەیە نادەن چونکە سەرچاوەکانی ئەو ماددەیە لە (هیت)دا زۆرترە کە دەکەوێتە سەر فورات وخەڵك لەوێ بەزۆری بۆ ناوپۆشکردنی کەشتیەکانیان بەکاری دەهێنن، کەچی لەو ناوچەیەدا نەوت ڕەواجی هەیە کە لەجۆری ڕەشی ئاساییە وخەڵك وەك سووتەمەنی بۆ چراکانیان لەجیاتی زەیت بەکاری دەهێنن... هەرچی چرای پاشاکان و دەوڵەمەندەکانی بەغدایە ئەوا لەپەڕۆی کۆنی بەنەوتکراو پێکدێت کە ووشك دەکرێتەوە لەجیاتی چرا بەکار دەهێنرێت. هەر بەو نەوتەش کۆچەر وجووتیارە عەرەبەکان لەسەرەتای بەهار لاشەی حوشترەکانیان سواق دەدەن کاتێك تووکی دەوەرێت بۆ ئەوەی تووکی نوێی بێتەوە. هەروەها زانیم کە لەو ناوچەیە نەوتی سپی هەیە و خەڵك وەك دەرمان بۆ چارەی هەندێ نەخۆشی بەکاری دەهێنن. بەدڵنیاییەوە پێیان گوتم کە ئەگەر ئەو نەوتە بڕژێنرێتە سەری هەر کەسێك ئەوا دەچێتە ناو لەشی و وەك ئارەقە لەپێ وپلی دێتەدەر".(١)

لە (٢٩)ی حوزەیرانی ١٧٥٨ کاروانەکەی ئیڤز کەرکوکی بەجێهێشت ولەڕێگای هەولێرەوە بەرەو موسڵ هەنگاوی نا. لەبەرەبەیانی ڕۆژی دواتر گەیشتە ئاڵتون کۆپری (پردێ). دکتۆر ئیڤز دەڵێ لەکاتژمێر چوارو نیوی بەیانی بەلای گوندێکی خراپووچکەدا تێپەڕین کە لەدیوی چەپی ڕێگاکەوە درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە پردێکی نوێ. ئەو پردە لەتەنیا تاقێکی بەرز پێکدێت وبەسەر پشتی وولاغەوە سەرکەوتنی زۆر زەحمەتە. لەم دواییەدا لەکیسەی سلێمان پاشا ئەبولەیلەی والی بەغدا بنیادنراوە. پردە کۆنەکەش بەوێرانی لەنزیکی پردە نوێیەکە دەبینرا بەڵام تائەو کاتە دوو تاقی بەپێوە مابوو کە (٤٥) پێ لەقوولایی زێیەکە بەرز بوون. کاروانەکە دوای ئەوەی لەپردەکە پەڕییەوە بۆ ئاڵتون کۆپری چوو. ناوبراو لێرەدا چەند تێبینییەك تۆمار دەکات: لەبارەی پردە کۆنەکە دەڵێ کریستیانە کۆنەکان ئەم پردەیان لەو شوێنە دروستکردووە. لەبارەی زێی بچووکیش دەڵێ ئەم زێیە لەناو جەرگەی شاخەکانی کوردستان سەرچاوە دەگرێ ودواجار دەڕژێتە ناو

(١) رحلة نيبور الى العراق في القرن الثامن عشر، ت:د. محمود حسين الأمين، بغداد ١٩٦٥، ص٨٣-٨٤.

دیجلەوە. هەروەها دەڵێ ئەم زێیە ماسی نایابی تێدایە کە کێشی هەندێکیان دەگاتە (٢٠٠) ڕەتل. گومان لەوەدانیە کە ئیڤز لێرە مەبەستی ماسی (البز) ـە کە جۆرێکی ناسراوەو قەبارەی گەورە دەبێت وهەتا ئێستاش لەم زێیەدا زۆرە. لەڕێگای هاتنیان بۆ ئاڵتون کۆپری ئیڤز باس لەوە دەکات کە گوللەتۆێکی بەردینی گەورەیان بینی و پێیان گوتن ئەوە یەکێکە لەو گوللەتۆپانەی کە تۆپەکانی نادرشا لەکاتی هێرشەکەیان بۆ ئەو ناوچەیە بەکاریان هێناوە. هەروەها ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو گوندە بەناوبانگە (واتە:ئاڵتون کۆپری) لەڕووی ئابوورییەوە پشت بەو کاروانانە دەبەستێ کە بەلایدا تێدەپەڕن. لەپاڵ ئەو بەروبوومە کشتوکاڵیانەی کە بەرەمی دێنێت. بەتایبەتی شفتی نایاب و گندۆرەی بەنێوبانگ.ئنجا دەڵێ لوتکەو ناوچە شاخاویەکانی نزیك ئێرە، زۆر جار دەبنە پەناگەی ئەو جەردە وڕێگرانەی هێرش دەکەنە سەر کاروان وڕێبواری بێ چەك و ئەوانەی توانای بەرگرییان نیە.

لەکاتژمێر (٧)ی ئێوارە کاروان لەئاڵتون کۆپری کەوتەڕێ بەرەو هەولێر، لەڕێگادا پاسەوانان ناوبەناو تەقەیان دەکرد بۆ ترساندن ودوورخستنەوەی جەردەو ڕێگران. ئەمە کارێك بوو هەموو کاروانەکان دەیانکرد. لە (١)ی دوای نیوەشەو گەیشتنە (یەنی خان) واتە کاروانسەرای نوێ، بەڵام لەڕۆیشتن بەردەوام بوون تا لەکاتژمێر (٥)ی بەرەبەیان لەدوورەوە هەولێر بەدیارکەوت.

یەکەم سەرنجی ئیڤز لەبارەی هەولێر ئەوەیە کە لەوانەیە ئەو شارە پاشماوەی (ئەربێللا)ی کۆن بێت کە لەدەوروبەریدا دارای شای فارس لەبەرامبەر ئەسکەندەری مەکدۆنی شکستی خوارد ولەنیوەی شەودا دوای کۆتایی هاتنی شەڕی گۆگامبیا (گۆگمێللا) پاشەکشەی کرد بۆئەوێ. بەڵام مانەوەی دارا لە ئەربێللا درێژەی نەکێشا، چونکە بەرەو وڵاتی ماد چوو بەمەبەستی کۆکردنەوەی هێزی شەڕکەری نوێ بۆ لەشکرەکەی. ڕاستەوخۆ دوای ڕۆیشتنی دارا ئەسکەندەر دەستی بەسەر هەولێردا گرت وبڕێکی زۆر کەلوپەلی شای ئێرانی تێدا دۆزییەوە، سەرباری ئازوقەی لەشکری ئێرانی و (٤٠٠) تالنت لەوەی کە دارا پێش شەڕەکە لەوێی دانابوو. یەك تالنتیش بەگوێرەی فەرهەنگەکان یەك کێش (بەعەرەبی:وەزنە) زیوە کە ئەویش دەکاتە (٣٤٠) پاوەندی ئیستەرلینی، یان یەك کێش زێڕ کە بەرامبەری نزیکەی (١٠) هەزار پاوەندە.

سەبارەت بەقـەلاّی هـەولێریش ئیڤـز دەڵـێ وەك قـەلاّی کـەرکوك لەسـەر گردێکـی دەستکردی بەرزی شێوە بازنەیی دروستکراوە کە چوونەناوی سـەختە. بـەلاّم گوندەکـەی نزیك قەلاّ — مەبەستی ئاوەدانی دامێنی قەلاّیە- هەرچەندە تەنیا گوندێکی بوودەڵەیـە، کەچی بەئاشکرا گـەواهی ئـەوە دەدات کـە لەشـوێنی شـارێکی گـەورەی سـەردەمانی پێشووە. ئەویش بەتێبینی کردنی فراوانی گۆڕستانە کۆنەکە وهەندێك کەلاوە کـە تائـەو کاتە لەوێ مابوون[1].ناوبراو قـەلاّی هـەولێر بـە (٢٠) پـێ بـەرزتر لەقـەلاّی کـەرکوك دەقەبڵێنێ. هەروەها دەڵێ ئەو شارەش کەوتەبەر شالاّوی نادرشا ودوای گەمارۆدانێك کە لە (٥-٦) ڕۆژ تێنەپەڕی دەستی بەسەر داگیرا. ئنجا دەڵێ ئاوەدانییەکـەی خـوار قـەلاّ لەلای باشووری ڕۆژئاوای بوو. سەرباری ئەمانە لەبارەی هەولێر باسی ئەوە دەکـات کـە ڕێبـوارانی کاروانەکـە توانییـان لـەوێ بڕێکـی تـەواو نـانی بـاش و هێلکـەو شـیریان دەستکەوێ، لەگەڵ مەڕێك وهەندێك سێوە سوورە.

لەکاتژمێر (٨)ی ئێوارەی ئەو ڕۆژە کاروانەکە هەولێری بەجێهێشـت و لەدەوروبـەری (٥) ی بەرەبەیان دوای پەڕینەوە لەزێی گەورە گەیشتە ئاسکی کەڵەك. ئیڤز دەڵـێ لـەو گوندە لەخانووێکی پاك وخۆش دابەزین و بەدرێژایی ئەو ڕۆژە لەوێماینەوە.هەر ئەوسا لەیەکێك لەو ئاغایانەی لەموسڵەوە هاتبوو زانییان کە پاشایەکی نوێ لە حەلەبـەوە بـۆ موسڵ هاتووە.بەو نزیکانەش کاروانە مەزنەکەی بـە (٤٠) ئـالاّ و (١٠٠٠) سـەربازەوە لەموسڵەوە بەرەو حەلەب دەگەڕێتەوە. مەبەستیش لەپاشا نوێیەکە لێرە (حاجی حوسێن پاشای جەلیلی)یە کە لەکاتی ئابلوقەدانەکەی موسڵ توانیبووی سـەرکەوتووانە لـەڕووی نادرشا بوەستێ. ئەوەبوو دوای ئەوە بۆ حەلەب گوازرایەوە. دواییش لەسـاڵی ١٧٥٨ بـۆ جاری کۆتایی هێنرابۆوە موسڵ و هەر لەوێش مرد.

ئەو ئەفسەرەی کە لەگەڵ مەفرەزەیەکی سەربازی لەهەولێرەوە بۆ پاراستنی کاروانەکە ڕاسپێردرابوو، لەگەڵیدا گەیشتە کەڵەك. بەلاّم ئاغای بەرپرسی کاروانەکە زەحمەتی بینی لەڕازیکردنی ئەفسەری ناوبراو بۆ ئەوەی کە بەهـەمان شـێوە بیانگەیەنێتـە موسـڵیش. گوایا ئیڤز لەگوندی کەڵەك زانیویەتی کە ئـەو ئەفسـەرە گومـانی ئـەوی لێـدەکرێ کـە پەیوەندی بەدز و ڕێگرە شـاخاویەکانەوە هـەبێت و هاوبەشـیان بێـت لـەوەی دەسـتیان

---

(١) لەوانەیە مەبەستی منارەی چۆلی بێت.

دەکەوێت.[1] بەڵام دوای ئەوەی بەڵێنی (٢٥) قرشیان پێدا بۆ خۆی ئەو (١٢) سەربازەی لەگەڵیدا بوون، ڕازیبوو بەم ئەرکە هەڵبستێ.ئەو پیاوەی ئەم زانیارییەی دایە ئیڤز تێیگەیاند کە ئەو جۆرە هەڵسوکەوت کردنە لەلایەن ئەو ئەفسەرەوە شتێکی سەیر نیە، چونکە ئەو و هەموو دانیشتوانی ئاسکی کەڵەك لەئێزیدییە شەیتان پەرستەکانن.[2]

بەم بۆنەیەوە ئیڤز چەند زانیارییەك لەبارەی ئێزیدیەکان تۆمار دەکات، کە لەباوکە لانزای مژدەدەری ئیتاڵیایی لەموسڵ وەریگرتبوو. ناوبراو دەڵێ ئەم خەڵکانە ڕۆژێك لەڕۆژان فەلە بوون دواتر موسڵمان بوون و ئنجا لێی هەڵگەڕاونەتەوە بۆ پەرستنی شەیتان. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا تا ئەو کاتە لەناخۆشی و تەنگانەدا هاواری مەسیح دەکەن. ئەوان دەڵێن شەیتان ئێستا ناتەبایە لەگەڵ خودای بەرز و بێ هاوتا. بەڵام ڕۆژێك لەڕۆژان واز لە خۆبەزل زانین دێنێ وملکەچی ئەو دەبێت. لەبەرئەوەی خوداش بەخشندەو میهرەبانە بۆیە هەموو تاوان وخراپەکاریەکانی شەیتان دەبوورێ. ئەو کاتەش بۆ شەیتان و شوێنکەوتووانی هەیە کە بەدڵنیاییەوە بچنە بەهەشت. دوای ئەمە ئنجا ئیڤز بەکەمێك درێژییەوە باس لەبڕوای ئێزیدیەکان بەخودی شەیتان دەکات.[3]

لەدەوروبەری نیوەی شەو کاروان لەکەڵەك جولەی کرد بەرەو موسڵ و بەئاراستەیەکی لار بەلای ڕۆژئاوادا دەڕۆیشت. لەکاتژمێر (٣) ڕووبارێکی بچووکی کەوتە پێش کە لەسنووری ئێرانەوە سەرچاوە دەگرێ و دەڕژێتە دیجلە. لەوانەیە ئیڤز مەبەستی لەمە ڕووباری خازر بێت. دوای ئەوە بە(٢) سەعات گەیشتنە گوندێکی بچووکی فەلان کە (کەرملیس) یان (گاورکۆی) پێدەڵێن. سەرداری گوندەکە بە ئیڤزی گوت گوایە ئەو گوندە ڕۆژێك لەڕۆژان لەڕووی ئاوەدانییەوە شارێکی گەورەی وەك موسڵ بووە. ئەو کاتە مەڵبەندی مەترانی کلدانی بوو، بەڵام دوای بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەم دەڤەرانە بچووك

---

(١) لەگەشتنامەکان و سەرچاوەکانی سەردەمی عوسمانی زۆر جار کورد بەرێگری وجەردەیی تاوانبار دەکرێت، بۆ زانینی سەرچاوەی ئەم تاوانبار کردنە وبەرپەرچدانەوەی بڕوانە: سعدي عثمان، المصدر السابق، ص٢٨٦.

(٢) کوردە ئێزیدییەکان لەدەولەتی عوسمانییدا سەردەمانێکی زۆر بەچاوێکی نزم سەیر دەکران وهەرچی خراپەکاری وگەندەڵی هەبوو دەخرایە پاڵیان. لەم بارەیەوە بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ص١٤٧-١٤٨.

(٣) بێگومان ئەم زانیارییانە سەرپێیین وهەڵەیان پێوەدیارە، بۆ زیاتر ئاشنا بوون لەم بارەیەوە بڕوانە: نەجم ئەلوەنی، ئایینی ئێزیدی لەنێوان چەند جەمسەری و بڕوای یەکتاپەرستیدا، هەولێر ١٩٩٩.

بۆتەوەو بایەخی کەم بۆتەوە. بۆیە تەنیا (٣٠) خێزانی تێدا ماوەتەوە کە لەوەچەی دانیشتووانی پێشوون. ئەوانە لەگەڵ فەلەکانی شوێنەکانی تری موڵکی سوڵتانی مەزن (ئیمپراتۆریای عوسمانی) ئازادی ئایینی تەواویان هەیە، بەمەرجێك هەوڵی بڵاوکردنەوەی ئایینەکەیان نەدەن وموسڵمانان وەرنەگێڕنە سەر مەسیحیەت. بۆیە هەبوونی مژدەدەرەکان هیچ سوودێکی لەم وولاتە نەما کە بەگوتەی ئیڤز هیچ موسڵمانێك تیایدا نەبۆتە فەلە لەرۆژانی کۆچییەوە.

بەڕێوەچوونی دانیشتوانی کەرملیس لەسەر کشتوکاڵ وچنینی هەندێ جۆری چنراوی کەتانی زبرە. کڵێسایەکی تێدایە لەگەڵ چوار قەشە کە بۆیان هەیە ژن بێنن. لەنزیکی ئەو گوندە گردێکی دەستکرد هەیە کە لەسەردەمانی پێشوو قەڵایەکی لەسەر بووە. بەڵام لەخودی گوندەکە کە بەکۆمەڵێ زبڵ و خاشاك دەورە دراوە، پاشماوەی کڵێسایەکی کۆن هەیە. لەبارەی زمانی دانیشتووان ئیڤز تێبینی کرد کە بەکلدانی ڕەسەن وهەروەها عەرەبی و تورکی دەئاخڤن. لەنزیکی کەرملیس گۆڕی (قەددیسە باربارە) هەیە کە بەدەستی باوکی کوژرا لەئەنجامی مکوڕبوونی لەسەر ئایینی مەسیحیەت. دەڵێن گوایە کاتێك باوکی هەوڵیداوە بیکوژێ شمشێرەکەی دەستی شکاوە، بۆیە دەستیکردووە بەسووتاندن و پارچەپارچە کردنی لاشەکەی. هەروەها دەگێڕنەوە کە تۆمای قەددیسی مژدەدەری مەسیحی سەری لەنەینەواو کەرملیس داوە کاتێك پیایاندا تێپەڕیوە بەرەو دوورگەکانی هیندی ڕۆژهەڵات.

هەر لەو دەڤەرەدا ئیڤز کاریگەری ئەو گرانی وبرسێتییەی بەدیکرد، کە لەساڵی ١٧٥٧ بەهۆی هاتنی کوللۆ وبەستەڵەك کەوتبۆوە وئەو ناوچەیەی گرتبۆوە کە لەدیاربەکرەوە درێژ دەبێتەوەتا موسڵ و دەوروبەری. لەنیوەشەوی (٣)ی تەموز کاروانەکە لەکەرملیس جمی و لەبەرەبەیان گەیشتە موسڵ، دوای ئەوەی بە نەینەوا وگۆڕی یونس پێغەمبەر تێپەڕی و لەبەشێکی دیجلە لەسەر پشتی وولاغ و لەبەشەکەی تر لەسەر پردێك پەڕینەوە کە لەسەر نۆزدە بەلەم داندرابوو.

## ئامێدی

## لەگەشتنامە وسەرچاوە مێژووییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا*

**پێشەکی:**

ئامێدی بەحوکمی ئەوەی یەکێکە لەشارە هەرەکۆن ودێرینەکانی کوردستان وبۆ ماوەی چەند سەدەیەك پایتەختی میرنشینی بادینان بوو، لەتۆماری مێژوودا بایەخی تایبەتی خۆی هەیە.هەر بەهۆی ئەمەش تەنانەت دوای ڕووخانی ئەم میرنشینەش بۆ ماوەیەکی درێژ هەر بەناوەندی ئەو دەڤەرە ماوەتەوە کەناوی بادینانی پاراستووە. لەئەنجامی ئەمەدا لەسەرچاوە مێژووییەکاندا بەزۆری ناوی هاتووە ولەزۆربەی لایەنەوە باسی کراوە. وە هەرچەندە ژمارەیەکی کەم گەڕیدەی بیانی بە ئامێدیدا تێپەڕیون — لەبەر ئەوەی لەسەر ڕێی سەرەکی نەبووە — بەڵام بووەتە جێگەی سەرنجی ئەو گەشتیار وگەڕیدانەی کەبەناوچەکەدا گوزەریان کردووە.

ئامانجی ئێمە لەم توێژینەوەیە ئەوەیە کەهەڵکەوتی جوگرافی و بارودۆخی ئاوەدانی وهەلومەرجی کۆمەڵایەتی و دانیشتوان لەگەڵ لایەنەکانی ئابووری شاری ئامێدی و دەوروبەری بەپێی گوزارشی گەڕیدەکان وزانیارییەکانی سەرچاوە مێژووییەکانی سەدەی نۆزدەهەم بەدیار بخەین. بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر لەو سەرچاوە نێوبراوانە کەباسی ڕووداوەکانی ناوچەکەیان کردووە بەر لەساڵی ١٨٤٢ـ کەهێشتا میرنشینی بادینان مابوو ـ هەر لەچوارچێوەی گێڕانەوەی ڕووداوە سیاسی و سەربازییەکانی میرنشینی بادینان ناوی (ئامێدی) یان هێناوە، بۆیە ئەم توێژینەوەیە هەموو سەرچاوەکان ناگرێتەوە، یان بەواتایەکی تر ئەم زانیارییانە وسەرچاوەکانیان مەبەستی ئێمە نین.

---

* ئەم باسە لەبنەڕەتدا توێژینەوەیەکی ئەکادیمییە و لە (گۆڤارا زانکۆیا دهۆك/ مرۆڤایەتی ـــ ئەکادیمی)، پەڕبەندا (١١) هژمارا (٢) کانونی یەکەم ٢٠٠٨، هاتۆتە بڵاوکردنەوە.

وه لەبەرئەوەی لەسەدەی نۆزدەهەمدا وەرچەرخانێکی گرنگ وچارەنوسساز لەمێژووی دەڤەری بادینان بەگشتی وئامێدی بەتایبەتی ڕوویدا کاتێ لەساڵی ١٨٤٢ دا میرنشینی بادینان لەنێوبرا، بۆیە ئەم سەدەیە کرایە چوارچێوەی زەمەنی ئەم توێژینەوەیە. ئـەوەبوو لەدوای ئەم ڕووداوە شاری ئامێدی بایەخی ڕامیاری خۆی لەدەسـتدا وهـەروەها لـەڕووی کارگێڕی و ئاوەدانی و ئابووریشەوە بەرە بەرە لە پاشەکشـە دابـوو . ئەمـە لەلایـەك و لەلایەکی تریش لەدوای ئەم بەروارەدا سەرچاوە مێژوویەکان کە متر زانیارییان لـەبارەی ئامێدی تۆمار کردووە بەحوکمی ئەوەی لەم ماوەیەدا زۆرکەم بووە تە ناوەندی ڕووداوە سیاسی و سەربازییەکانی ناوچەکە. لە سۆنگەی ئەمەوە کارێکی بێ سـوود نیـە ئەگـەر گەڕانێك بەنێو گەشتنامەو سەرچاوە مێژوویەکانی ئەم سەدەیەدا بکەین ولەسەر سەرنج و زانیارییەکانی گەڕیدە و مێژوونووسەکانی ئەم ماوەیە لەبارەی شاری ئامێدی ڕاوەستین و لێکدانەوەیان بۆ بکەین.

**دەروازە: ئامێدی بەر لەسەدەی نۆزدەهەم:**

پێش ئەوەی بێینە سەر مەبەستی سەرەکی باسەکە کە سەدەی نۆزدەمە خـراپ نییـە ئەگـەر وەك دەروازەیـەك ئاوڕێـك لـەبارودۆخی ئامێـدی لـەماوەی سـەدەکانی پێشـوو بدەینەوە:

شاری ئامێدی کە نزیکەی ١٦٢ کم لە باکووری ڕۆژهـەڵاتی موسـڵەوە دوورە لـە بنەڕەتدا قەڵایەکی کۆن و دێـرینە[(١)].ئەم قەڵایە لە سـەر شـاخێکی سروشـتی ڕوتـەخت بنیادنراوە کە لە نێوان (٣٠٠ ـ٤٠٠ ) پێ لە زەمینی دەوروبەری خـۆی بـەرزترە[(٢)]، وە نزیکەی (١٢٥٠ ) پێ لە ئاستی ڕووی دەریا بەرزە.[(٣)] ئامێـدی نـاوی لـە زۆربـەی

(١) جمال بابان،اصول اسماء المدن والمواقع العراقية،ط٢،بغداد١٩٨٦،ص٢١١-٢١٢. لەبارەی ناوی (ئامێـدی) وڕەگ وڕیشە مێژوویەکـەی بڕوانـە: هـەمان سەرچـاوە، ص٢١١-٢١٣; هـەروەها: أنـور المـايي، الاكـراد في بهدينان،ط٢،دهۆك ١٩٩٩،ص٤١-٤٣. شایانی باسە ئێستا ئامێدی مەڵبەندی قەزایەکە لەپارێزگای دهۆك.

(٢) انورالمايي، م . س، ص٤١.

(٣) كـاوه فريـق احمـد شـاوه لـي ئاميـدي، امـارة بادينـان ١٧٠٠-١٨٤٢/دراسـة سياسـية اجتماعيـة ثقافية،منشورات مؤسسة موكرياني/ اربيل،مطبعة خبات- دهوك ٢٠٠٠، ص٢٥ .

سەرچاوە مێژووییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا هاتووە و وەك قەڵایەکی قایم و سەختی کوردان کەڕۆڵی لەڕووداوەکانی ناوچەکەدا هەبووە باسی لێوەکراوە.[1] هەروەها لە سەرچاوەکانی سەردەمی عوسمانیش وەك پێگەی میرنشینی بادینان چەندەها جار ناوی براوەو باسی قایمی و دژواری کراوە.[2]

شەرەفخانی بەدلیسی کاتێ باسی میرنشینی بادینان دەکات لە بارەی قەڵای ئامێدیدا دەڵێ: " ئەم قەڵایە لەگەڵ شارەکە دەکەوێتە سەر شاخێکی بەردی بازنەیی کە بەرزییەکەی لە هەندێ لاوە بە (١٠٠) باڵ [ذراع] دەخەملێنرێ"، وە ئاماژە بە هەبوونی دوو بیری ئاو دەکات لە شارەکەداو دەڵێ :"ئاوەکانیان بۆ گەرماو و قوتابخانە و زۆر شوێنی تر بەکاردەهێنرێن، بەڵام ئاوی خواردنەوە ، دانیشتووان لەدەرەوەی شار بە پشتی وولاغ دەیهێنن "[3]. بێگومان ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کەئەم شارە لە سەدەی شازدەهەمدا تا ئەو ڕاددەیە ئاوەدان بووە کە بایەخیشیان بە خوێندن و زانست داوە، چونکە خوێندن و قوتابخانە لە ژێرسایەی ئاوەدانی و ئارامی دەبووژێنەوە. لە ڕاستیشدا هەر شەرەفخان خۆی دواتر باسی خێرخوازی و ئایین پەروەری خەڵکی ئامێدی دەکات و ئاماژە بە هەوڵی دەسەڵاتدارانی دەکات بۆ بنیادنانی قوتابخانە و مزگەوت ،کە بەئەرکی زانایان بوونەتە هۆی برەودان بە کاروباری زانستی ئایین و بڵاوبوونەوەی خوێندەواری.[4]

---

(١) بۆ نموونە بڕوانە : احمد بن علي القلقشندي (ت:٨٢١هـ/١٤١٨م)، صبح الاعشى في صناعة الانشا، بيروت ١٩٨٧،ج٤، ص٣٧٨،ج٧،ص٣٠٩; عزالدين ابن الاثير(ت:٦٣٠هـ/١٢٣٣م)، الكامل في التأريخ، دار الفكر، بيروت ١٩٧٨،ج٩،ص٣٦٣.

(٢) بۆنموونە بڕوانە: محمد سعيد المدرس،گلشن معارف (بەزمانی تورکی) ج١، استانبول ١٢٠٢هـ،ص٦٦٧; هامەر،دولت عثمانية تاريخي (بەزمانی تورکی) ،مترجمي: محمد عطا ،ج٩،أوقاف اسلامية مطبعه سي،استانبول ١٣٢٩،ص١٦; نظمي زاده مرتضى افندي،كلشن خلفا، ت: موسى كاظم نورس، مطبعة الاداب ـ النجف ١٩٧١،ص٢٩٧.

(٣) شرف خان البدليسي،شرفنامه،ت:محمد جميل الملا احمد الروزبياني،ط٢،منشورات مؤسسة موكرياني،مطبعة وزارة التربية ـ اربيل٢٠٠١،ص٢٥٤.

(٤) م . ن، ص٢٥٤.

وه سەبارەت بە سەرچاوەکانی ئاو لە ئامێدی گەڕیدەی عوسمانی (ئەولیا چەلەبی) لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەمدا ئاماژە بە هەبوونی دوو سەرچاوەی گەورە دەکات لە نێو ئەم قەڵایەدا و دەڵێ: "ئەم دوو ئاوە لـە کێوەکـانی (پەشـیش) دێنــەدەرو بــەژێر پــردی (قوبخان) [ لەڕاستیدا(قوبەهان) ــە] دادەڕۆن و تێکەڵی شەت دەبن".[1] ئەمەش مانـای ئەوەیە کە ئەم دووئاوە کانی و سەرچاوەن و لەنێو قەڵای ئامێدیدا هەبوون . لەکاتێکـدا (تاڤەرنیێ)ی گەڕیدەی فەرەنسی ـ کە لە هەمان مـاوەدا سـەردانی شـارەکەی کـردووە ـ زانیارییەکی پێچەوانی ئەمانەمان دەداتێ و دوای ئـەوەی دەڵـێ: " ئامێـدی شـارێکی خۆشە ...و دەکەوێتە سەر شـاخێکی بـەرز کـەناتوانرێ بـە کـەمتر لـە سـەعاتێك بـۆ لوتکەکەی سەرکەوی"، ئاماژە بەوە دەکات کە " لەنیوەی ڕێگادا لەنێو بەردان دا سـێ یان چوار کانی هەڵدەقوڵێ ، کە خەڵکەکە بەمەڕومالاتەکانیانەوە دێنە سەریان و هەموو بەیانییەك کوندەکانیان لێی پڕدەکەن ، چونکە ئاو لە شارەکەدانیە".[2] لێـرەدا دەتـوانین بڵێین زانیاریەکانی (تاڤەرنیێ) زیاتر لەڕاسـتیەوە نزیکـە، لەبـەر ئـەوەی ئـەم گەریدەیـە بەپێچەوانەی شەرەفخان و ئەولیاچەلەبی خۆی سەردانی ئامێدی کردووە . ئەمە لەلایەك ولەلایەکی تریش دەبینین ڕۆژهەڵاتناسێکی تر کە ناوی (هنـری فێلد)ــە لەسـەرەتاکانی سەدەی بیستەم باسی ئەوە دەکات کە ئامێدی ئاوی کەمە و هیچ بیرێك لەناوشـارەکەدا نییە کەبتوانرێ سوود لە ئاوەکەی وەربگیرێ . وە ئەویش دەڵـێ ئامێـدی پشـت بـەدوو کانی یان سەرچاوە دەبەستێ کە لە نیوەی ڕێگـای سـەرکەوتنی قەڵاکـە دایـە.[3] بـەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ڕێی تێ دەچێ لەسـەردەمی (شـەرەفخان ) بـیری ئـاو لـەناو ئامێدیـدا هەبووبێ و ئەوکانیاوانەی (ئەولیا چەلەبی) یش باسی کردوون دیارە مەبەستی ئەوە بـوو لەقەدی قەڵای ئامێدیدا هەڵقوڵاون نەك لەنێوشارەکەدا.

---

(١) ئەولیا چەلەبی، کورد لەمێژووی دراوسێکانیدا(یان ـ سـیاحەتنامەی ئـەولیا چـەلەبی) و: ناکـام، بەغـدا ١٩٨٨، ل٥٧.

(٢) جان باتیست تافرنییە،العراق فی القرن السابع عشرکما رآه الرحالة الفرنسي تافرنییە،ت: بشیر فرنسیس وکورکیس عواد، مطبعة المعارف، بغداد ١٩٤٤، ص١١٧.

(٣) د.بـدرخان السـندي ، المجتمـع الكـردي في المنظـور الاستشـراقي، منشـورات دار ئـاراس ،مطبعـة وزارة التربیة،اربیل ٢٠٠٢، ص٤٩٠.

لەبارەی ئاستی ئاوەدانی شاری ئامێدیش (تاڤەرنیێ)ی فەرەنسی ـ کە لەناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەمدا هاتۆتە شارەکە ـ دەڵێ: " ئامێدی شارۆچکەیەکی نە گەورە و نە بچووکە" بەڵام ئەوە زیاد دەکات کە: "قەیسەرییەکی گەورەی لەناوەڕاستدایە چەندین دوکانی تێدایە کە هەموو جۆرەکانی بازرگانان لەخۆ دەگرێ".[1] بێگومان هەبوونی ئەم بازاڕ و قەیسەرییە گەورەیە لە لایەك بەڵگەیە لە سەر ئاوەدانی شارەکە، بەوپێیەی دوکان و بازاڕی گەورە بێ کڕیار و دانیشتوانی زۆر هەبوونی نابێت . لەلایەکی تریش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئامێدی ڕۆڵی مەڵبەندێکی بازرگانی بینیوە بۆ ناوچەکانی دەوروبەری هەروەکو دواتر ئاماژەی پێ دەکەین .

ئەو بایەخە ئابوورییەی ئامێدی بۆتە جێگەی سەرنجی گەریدەیەکی بیانی تریش کە نزیکەی سەدەیەك دوای (تاڤەرنیێ) هاتۆتە ناوچەکە ، ئەویش (نیپۆر)ی بەرەچەڵەك ئەلمانی و بەڕەگەزنامە دانیمارکییە کە لە ساڵی ١٧٦٦ لەچوارچێوەی گەشتێکی زانستی بەکوردستاندا تێپەڕی. ناوبراو لە بارەی میری ئامێدیدا دەڵێ : "بڕێکی زۆر بەروبووم لە ناوچەکەیدا هاوردە [استیراد] دەکرێ و هەروەها چەندین کانی قورقوشم و ئاسن هەیە کە هەڵدەستێ بە دەرهێنانی و سوود لێ وەرگرتنی ".[2] دیارە (نیپۆر) بەهەمان شێوە ئاگاداری بایەخە ستراتیژییەکەی شارەکەش بووە، بۆیە لەم بوارەیەوە دەنووسێ:"قەڵایەکی قایمە ودەکەوێتە سەر شاخێکی زۆر ڕك، ڕێگەکانیشی سەختن و ناتوانرێ دەستی بەسەر دابگیرێ ".[3]

ئەگەر گەڕیدە و گەشتیارە بیانییەکان بەم شێوە یە گرنگی و بایەخی هەمەلایەنەی شاری (ئامێدی) یان بۆ دەرکەوتبێ، شتێکی ئاساییە کە نووسیار و مێژوونووسانی ناوچەکە زیاتر هەستیان بەمە کردبێ، ئەوەتا (محمد امین العمري ١٧٣٨ ـ١٧٨٨) کە زانا و مێژوونوسێکی خەڵکی موسڵ بوو لە بارەی ئامێدیەوە دەنووسێ : "قەڵایەکی

---

(١) العراق في القرن السابع عشر... ، ص١١٧ـ١١٨.

(٢) كارستن نيبور، رحلة نيبور الى العراق في القرن الثامن عشر ،ت: د.محمود حسين الامين، بغداد ١٩٦٥، ص٧٦ .

(٣) م . ن ،ص ٧٥ـ٧٦.

قایمە ، سەختە ، مەزنە ، سەری دەگاتە کەشکەلانی فەلەك ..."هەروەها بەزۆری خێـرو بێری ناوچەکەدا هەڵدەدات.[1]

لە پاڵ ئەمانە دەبێ ئەوەش بزانین کەشاری ئامێدی لەهەموو ئـەو ماوەیـەی لێـرەدا مەبەستمانە بێ کێشەو هەمیشە لەپەرەسەندندا نـەبوو ، بـەڵکو هەنـدێ جـار تووشـی کارەساتی سروشتی دەبۆوە، وەك بڵاوبوونەوەی پەتای (تاعون ـ ڕشانەوە ) لەشارەکەدا لە ساڵی (١٧٧٨ز) کەخەڵکێکی زۆری لـەناوبرد.[2] یـان ڕووبـەڕووی هێرشـی والیـەکانی دەوروبەر و کێشەو ململانێی ناوەخۆیی نێوان بنەماڵەی دەسەڵاتداری بادینان دەبۆوە.[3] بێگومـان هەمووئـەم کێشـەو کارەسـاتانە کاریگـەرییان بەسـەر شـارەکە و ڕەوشـی پەرەسەندنی بەجێ دەهێشت.

### ئامێـدی بەپێی گەشتنامە و سەرچاوەکانی سەدەی نۆزدەهەم:

سەرچاوە مێژووییەکانی سـەدەی نۆزدەهـەم ئەگـەر هەمووشـیان نـەبێ هەنـدێکیان زانیاری هەمەلایەنەیان لەمەڕ ئامێدی فەراهەم کردووە.بەتایبەتی ساڵنامەکانی موسڵی عوسمانی[4] کە لەپاڵ هەلومەرجی سیاسـی وکـارگێڕی لایەنـەکانی جـوگرافی وئـابووری

(١) محمد امین بن خیرالله الخطیب العمري، منهل الاولیاء ومشرب الاصفیاء من سادات الموصل الحدباء، ج١، تحقیق: سعید الدیوه جي،مطبعة الجمهوریة، الموصل ١٩٦٧، ص٦٧ .

(٢) یاسین بن خیرالله الخطیب العمري ، زبدة الاثار الجلیة في الحوادث الارضیة ، انتخب زبدته: د.داود الجلـبي، تحقیق: عماد عبدالسلام رؤوف، مطبعة الآداب، النجف ١٩٧٤، ص١٤٥.

(٣) هەر بۆ نموونە بڕوانە : م . ن، ص٩٤ هەروەها: یاسین بن خیرالله الخطیب العمري، غرائب الاثـر في حـوادث ربع القرن الثالث عشر،مطبعة ام الربیعین، الموصل ١٩٤٠ ،ص١٩ ، ٤٧ـ٤٨، رسـول حـاوي الكركوكلي،دوحـة الوزراء في تاریخ وقائع بغداد الزوراء، ت: موسى كاظم نورس،مطبعة كرم ،بیروت (د.ت)، ص٩٣.

(٤) ساڵنامە: زاراوەیەکی عوسمانی لێکدراوە لە هەردوو ووشەی (ساڵ) و(نامە) پێکهاتووە، کـە لەکوردیشـدا هەمان مانا دەبەخشێ واتە (نامە یان ڕاپۆرتی ساڵانە). دەولەتی عوسمانی یەکەم ساڵنامەی لەساڵی ١٨٤٧ دا دەرکرد، دواتریش ویلایەتەکان بـەم کـارە هەڵسـان،وە هەریەکـەیان زانیـاری گـارگێڕی وئـابووری وئـاوەدانی وجوگرافی ومێژوویی گرنگیان لەمەڕ ویلایەتەکانیان خستەڕوو.بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ساڵنامەکانی عوسمانی بڕوانە: حسن دومان،البیبلیوگرافیا والفهرس الموحد للسالنامات والنوسالات العثمانیـة، انقـره ١٩٩٩،ص٣٩

وكۆمەڵایەتیشیان خستۆتە ڕوو. هەروەها (یاسین العمري ١٧٤٤-١٨١٦) یش لەکتێبی (غایة المرام في تاریخ محاسن بغداد دارالسلام) دا لەچوارچێوەی ژماردنی هەرێمەکانی سەر بە بەغدا، باسی ئامێدی وناوچەکانی دەوروبەری کردووە و زۆر زانیاری جوگرافی وئابووری وکۆمەڵایەتی لەبارەیان تۆمار کردووە.[1] هەروەها لەکتێبی (غرائب الاثر في حوادث ربع القرن الثالث عشر) دا ڕووداوی هەمەجۆری ناوچەی بادینان دەخاتە ڕوو.[2] وە بەحوکمی نزیکی زەمەنی وجوگرافی زانیارییەکانی ناوبراو بایەخی مێژوویی بەرچاویان هەیە. لەپاڵ ئەمانە لەهەندێ سەرچاوەی تریش دەکرێ زانیاری لەبارەی ئامێدی دەست کەوێ وەك (قاموس الاعلام)ی (شمس الدین سامی) کە فەرهەنگێکی جوگرافی مێژوویی ئێتنۆگرافی عوسمانیە لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم داندراوە. لێرەدا ناکرێ هەندێ سەرچاوەی سەدەی بیستەمیش فەرامۆش بکەین ـ وەك (عباس العزاوي ـ العمادیة في مختلف العصور) وە (صدیق الدملوجي ـ امارة بهدینان الکردیة) ـ کەپشتیان بە زانیاری سەرچاوەکانی سەدەی نۆزدەهەم بەستووە.

سەبارەت بەگەشتنامەکانیش کە بۆچوون و سەرنجی گرنگیان لەبارەی لایەنە جۆراو جۆرەکانی تایبەت بە ئامێدی و ژیان و چالاکی دانیشتووانی نووسیوە. لەنێو ئەوانەی بایەخی سەرەکییان بۆ ئەم توێژینەوەیە هەیە دەبێ سەرەتا ئاماژە بە گەشتنامەکەی (کلۆدیۆس جیمس ریچ) بکەین کەلە ساڵی ١٨٢٠ دا لە بەغداوە گەشتێکی بۆ باشووری کوردستان کرد، ناوبراو هەرچەندە سەری لە بادینان نەداوە بەڵام لەڕێگەی خەڵکی سلێمانی هەندێ زانیاری گرنگی لەبارەی ئامێدی و میرنشینی بادینان تۆمار کردووە.[3] لەم زانیارییانەش گرنگتر ئەوەیە کە گەڕیدەیەکی فەرەنسی بەناوی (هێنری بێندەر) بۆی

---

ومابعدها.شایانی باسە ویلایەتی موسڵ پێنج ساڵنامەی دەرکرد ،کەئێمە لەم باسەدا مەبەستمان تەنیا ئەمانەیە.

(١) بڕوانە: یاسین العمري، غایة المرام في تاریخ محاسن بغداد دارالسلام، مطبعة دار البصري ، بغداد ١٩٦٨،ص٩٢ ومابعدها.

(٢) بۆ نموونە بڕوانە: یاسین العمري، غرائب الاثر ، صفحات ٢٣،٣٦،٣٧،٤٨،٧٠،٨٠.

(٣) بڕوانە: کلودیوس جیمس ریچ، گەشتی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، و:محەمەد حەمە باقی، چ١، ئێران-تەورێز ١٩٩٢،ل٦٧-٧٠.

بەجێ هێشتووین، چونکە ناوبراو لەساڵی ١٨٩٥ دا لەڕێگای هەکارییەوە هاتۆتە شاری ئامێدی و سەرنجی ووردی لەبارەی باری ئاوەدانی شارەکە و دانیشتوان و هەندێ نەریت و چالاکییان تۆمارکردووە.[١] ئەم گەڕیدەیە شایەتحاڵێکی گرنگە لەسەر ئەو هەلومەرجەی کە ئامێدی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا تێیدا بووە ، بۆیە بە بەراورد کردنی زانیارییەکانی ئەم گەڕیدەیە لەگەڵ بارودۆخی شارەکە لەنیوەی یەکەمی سەدەی ناوبراودا هێلی بەیانی یان ڕەوشی پەرەسەندنی ئامێدیمان بۆ بەدیار دەکەوێت ودەزانین ئایا سەر بەرەو هەوراز یان نشێوە. هەر بۆ ئەم مەبەستەش سوود لەزانیارییەکانی هەردوو برا (دەبلیو. ئەی. وێگرام) و (ئێدگار. تی. ئەی. وێگرام) وەردەگیرێ. چونکە ئەم دوو برا ئینگلیزە لەسەرەتای سەدەی بیستەم ـ واتە چەند ساڵێك دوای بێندەر ـ بۆ مەبەستی (ئاینی / موژدەدەری) گەشتێکیان بەکوردستاندا کرد و یەکێکیان سێ مانگ و ئەوی تریان بۆ ماوەی دە ساڵ لەوێ ماوەتەوە . بۆیە شارەزاییەکی باشیان لەبارەی ناوچەکەو دانیشتوانی پەیدا کردووە و لە کتێبێکدا تۆماریان کردووە.[٢] بێجگە لەم گەشتنامانە لێرەدا سوود لە زانیاری وگوزارشەکانی گەڕیدە و ڕۆژهەلاتناسانی تریش دەبینرێ کە لەشوێنی خۆیان ئاماژەیان پێدەکرێ.

وە بۆ ئەوەی بتوانین زانیاری و هەروەها تێبینی وسەرنجەکان بەرێکی بخەینە ڕوو، وە بەمەبەستی دەست کەوتنی دەرەنجامی مێژوویی ڕاست و دروست هەڵسەنگاندن وتوێژینەوەی پێویستیان بۆ بکرێ، واپێویست دەکات بەپێی ئەم بابەتانەی دادێ پۆلین بکرێن:

**أ- هەڵکەوت و بایەخی جوگرافی ــ ستراتیژی :**

هەرچەندە ئاشکرایە کە هۆکاری سەربازی و ئامانجی بەرگری کاریگەریان لەسەر بنیادنانی قەلای ئامێدیدا هەبوو، بەلام هەڵکەوت و شوێنەکەی لەبایەخی ستراتیژی -

---

(١) بڕوانە: هێنری بێندەر،سەفەرنامەی هێنری بێندەر/کوردستان ،میزۆپۆتامیا ،ئێران،و: ئەبوبەکر خۆشناو،سلێمانی ٢٠٠٦، ل ٢٥٢ و دواتر.

(٢) بڕوانە: دبليو. أي.ويگرام و أدگار. تی. أي. ويگرام، مهد البشرية / الحياة في شرق كردستان، ت: جرجيس فتح الله، ط٣، منشورات دار ئاراس، اربيل ٢٠٠١ ص٦-٧.

ئابووری بەدوور نەبوو.لەبەر ئەوەی ئەم قەلایە کەوتبووە سەرووی دۆلێکی بەرەز و باغ وەك لەسەرچاوەکانی عوسمانی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا هاتووە[1] و (هێنری بێندەر) گەڕیدەی فەرەنسیش کە لە هەمان ماوە بەوێدا هاتووە ئەمە دووپات دەکاتەوە.[2] بۆیە وەك ناوەندێك وابوو بۆ کۆکردنەوەی بەروبوومە کشتوکالییەکانی ناوچەکانی دەوروبەری. ئەوەتا (تاڤەرنیێ) لەناوەڕاستی سەدەی حەڤدەمدا [3] تێبینی ئەوەی کردووە کە "زۆربەی خەلکی وولاتی ئاشوور [مەبەستی کوردستانە] توتن و مازووی خۆیان دەهێننە ئەوێ ".[4] بێگومان ئەم کۆکردنەوەیەش بەشێك بوو لە پرۆسەی هەناردنی ئەم بەروبوومانە بۆ دەڤەرو وولاتانی دەوروبەر وەك پێشتر لە گوزارشەکانی (نیپۆر ) بۆمان بەدیارکەوت.[5] لەپاڵ ئەمەش ئامێدی کەوتبووە سەر ڕێگایەکی بازرگانی کە جوگرافی ناسێکی عێراقی ناوی دەنێ :"ئەو پێچە قۆقزەی نێوان ڕەواندز و جزیرەی بۆتان".[6] لەناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەمدا (تاڤەرنیێ)ی فەرەنسی ئاماژەی بەم ڕێگایە داوە و خۆشی لە (حەلەب)ەوە بۆ تەورێز پێیدا تێپەڕیوە.[7]

بێگومان بایەخی قەلای ئامێدی لەڕووی سەربازییەوە لایەنێکی زیاتر بەرچاو و گرنگ بوو بۆیە سەرنجی مێژوونوس و گەڕیدەکانی زۆرتر ڕاکێشاوە و زۆربەیان بەسەختی و قایمی قەلاکەیاندا هەلداوە و ستایشی شوێنەکەیان کردووە ; ئەوەتا (یاسین عومەری)

(١) شمس الدين سامي ،قاموس الاعلام ،ج٤،مهران مطبعه سي،استانبول ١٣١٠،ص٣٢٠٦; موصل ولايـتي سالنامة رسميسيدر ١٣٢٥ هـ، عزتلو صفوت بك معرفتيلة ترتيب و دردنجي دفعة اول رق ، موصل مطبعة سنده طبع اولنمشدر، ص ١٩٦.

(٢) بڕوانە: سەفەرنامەی هێنری بێندەر، ل٢٥٩.

(٣) لەپێناو زیاتر ڕوونکردنەوەی باسەکە ناچارین هەندێ جار پەنا ببەینە بەر زانیاری سەرچاوە وگەشتنامەکانی سەدەکانی پێشتر.

(٤) العراق في القرن السابع عشر... ، ص١١٧.

(٥) بگەڕێوە بۆبابەتی (ئامێدی بەر لەسەدەی نۆزدەهەم ) لەم یوێژینەوەیەدا .

(٦) د.ابراهيم شريف ،الموقع الجغرافي للعراق وأثره في تأريخه العام حتى الفتح الاسلامي،ج٢ ،بغداد (د.ت) ،ص١١٣.

(٧) العراق في ألقرن السابع عشر... ، ص١١٩.

که مێژوونووسێکی شاری موسل بوو لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا شاری ئامێدی بە "بنکەی وولاتی کوردان" دادەنێ وئاماژە بە بەرزی وسەختی قەلاکە وقایمی شورەکەی دەکات و دەڵێ "بە بەرزییەکەی دەگاتە ئاسمان".[1] هەروەها ڕۆژهەلاتناسێکی ئیتالی بەناوی (جۆزیبی کامبانیلی ١٧٦٢-١٨٣٥) زۆر زانستیانە تر لەمەڕ بایەخی سەربازی قەلای ئامێدیدا دەدوێ ودەنووسێ: "بەچەند تۆپێکی کەمی قەباره بچووك که واپێدەچێ گواستنەوەیان بۆ ئەوێ ئەستەم بێ، دەتوانێ خۆی بپارێزێ لەدژی هەر لەشکرێکی ئاسیاوی بەهێز. هێنانی ئەم تۆپانەش بۆ شارەکە لەلایەن باران پاشا وە[مەبەستی بارام پاشایە ١٧١٤-١٧٦٨]بوو".[2] لەڕاستیشدا ڕووداوە مێژووییەکان تارادەیەکی زۆر دروستی ئەم بۆچوونەیان سەلماندووە، بەجۆرێك میرانی بادینان بەهۆی قایمی قەلای ئامێدی وسەختی لەبەرامبەر دوژمندا توانیویانە چەندین جار خۆڕاگریی لەبەردەم شالاو وهێرشەکانی دوژمنانیاندا بکەن.[3] دیارە ئەم ڕۆژهەلاتناسە نێوبراوە ئاگاداری هەندێ ڕووداوی لەم جۆرە بووە بۆیە دەڵێ: "حەفت وەزیر وپاشایانی تری دەوروبەر چەند جارێك هەوڵیانداوە دەستی بەسەر دابگرن، بەلام بێ هودە بووە".[4] شایانی باسە هاوولاتییەکی هاوولاتییەکی تری ئیتالی کەناوی (دۆمنیکۆ لانزا) یە، لەیاداشتەکانیدا بۆچوونێکی هاوشێوە لەسالی ١٧٦٩ لەبارەی قایمی قەلای ئامێدی وخۆڕاگریی لەبەرامبەر هێرش وپیلانەکانی دەسەلاتدارانی عوسمانی دەخاتە ڕوو.[5] دەبێ هەر ئەمەش وای لەگەڕیدە

---

(١) غاية المرام، ص٩٢.

(٢) ميريلا غاليتي ، التراث الكردي في مؤلفات الايطاليين، ت: د.يوسف حبي، (گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق- دەستەی کورد)، مج(٨) ١٩٨١،ص٢٨١-٢٨٢.

(٣) بۆ نموونە بڕوانە: ياسين العمري، زبدة الاثار،ص٩٤ هەروەها: غرائب الاثر، ص١٠٨; انور المايي، م . س،ص١٣٩-١٤٠.

(٤) ميريلا غاليتي ، م . س ،ص٢٨١.

(٥) دومنيكو لانزا، الموصل في القرن الثامن عشر حسب مذكرات دومنيكو لانزا، ت: القس روفائيل بيداود،ط٢، الموصل ١٩٥٣،ص٦٢.

وشوێنەوارناسی ئینگلیزی (هنری لایارد) کردبێ کە قەلاّی ئامێدی بە "کلیلی کوردستان" لەقەڵەم بدات.[1]

لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە وسەرەتای سەدەی بیستەمیش گەڕیدە وگەشتیارەکان ئاماژەیان بەسەختی وقایمی قەلاّی ئامێدی وگرنگی شوێنەکەی کردووە، بەلاّم لەگوزارشەکانیان زیاتر واهەست دەکەی کە ئەوان مەبەستیان سەردەمانی ڕابردووە نەك ئەو کاتەی ئەوان تێیدان. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەئامێدی لەڕووی سیاسی وسەربازییەوە دوای ڕووخانی میرنشینی بادینان بایەخی جارانی نەماوە.ئەوەتا (هێنری بێندەر) ی فەرەنسی کە لەساڵی ١٨٩٥دا هاتۆتە ئامێدی دوای ئەوەی ئاماژە بەوە دەکات کەشارەکە لەسەر پانکێکی نزیکەی ٣٠٠-٤٠٠مەتر بەرز هەڵکەوتووە، لەوەسفی قایمی قەلاّکەدا دەڵێت: "ئیدی شار کە لەچاو بارودۆخە خراپەکەی ئێستایدا،پێشان قەلاّیەکی بەبایەخ بووە...پانکەکە بەدیوارێکی پتەو دەورە دراوە.تەنیا لەسێ دەروازە[2] ڕێگای بۆ دەچێ...هاتنی دوژمن بۆ گرتنی شار زۆر دژوار بووە. دەرگایەکی تاق-ئاسا بەدەرگایەکی پتەوی ئاسنی ژەنگ گرتوو، چەند پاسەوانێکی کلۆل، دەروازەی شار پێك دێنن".[3]

هەردوو برا (وێگرام) یش لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا کەباسی ئامێدی دەکەن دەڵێن: "شارۆچکەیەکە لەسەر بانێکی تەنیای گەورە هەڵکەوتووە،... دەبێ قەلاّیەکی قایم بووبێت کەمێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژانی ئاشوریەکان... ئەو شوورانەی کەسروشت پێیداوە هەمیشە بۆ پاراستنی بەس بوون، هیچ هۆیەکی بەرگری ناوێ جگە لەپارێزگاری کردنی هەردوو دەروازەکەی".[4]

---

(١) جليلي جليل وآخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، ت: د.عبدي حاجي،ط١،دار الرازي للطباعة والنشر،بيروت ١٩٩٢،ص١٣.

(٢) جێگەی سەرنجە هەندێ سەرچاوە ئاماژە بەسێ دەروازە وهەندێکی تر باسی دوو دەروازە دەکەن وەك دواتریش دەبینین ، بەلاّم لەڕاستیدا قەلاّی ئامێدی دوو دەروازەی هەبوو وەك ئێستاش هەر وایە.

(٣) سەفەرنامەی هێنری بێندەر، ل٢٥٢.

(٤) مهد البشرية...،ص٢٦٦.

پێش ئەوەی ئەم بابەتە تەواو بکەین، خاڵێك هەیە دەبێ باسی بکەین کەتایبەتە بە ئاووهەوای ئامێدی وزۆربەی ئەو سەرچاوانەی پشتمان پێ بەستوون ئاماژەی پێ دەکەن، ئەویش بەرزی پلەی گەرمای شارەکەیە لەهاویناندا، کە وادەکات دانیشتوان لەزۆربەی کاتەکانی ئەم وەرزەدا پەنا ببەنە بەر شوێنە بەرز وپڕ لەسابات وڕەز وباخەکانی دەوروبەری ئامێدی، کەدیارە شوێنی حەوانەوەی فێنکیان بۆ خەڵکەکە دابین دەکرد.[1] ئەوەتا (ریچ) لەم بارەیەوە دەڵێ: "ئامێدی لەهاویناندا هەواکەی گەرمە ونادروستە، بۆیە ئەچن بۆ ئەو هاوینە هەوارانەی کە نزیکەی دوو سەعات ونیوێك لەشارەوە دوورە وئەکەونە سەر ئەو بەرزاییانەی بەدرێژایی هاوین بەفریان پێوەیە. میر لەم کوێستانانەدا خانووی خۆی هەیە، کەخەڵکی تریش ساباتی تیا هەڵئەدەن".[2]

**ب- بارودۆخی ئاوەدانی و دانیشتوان:**

بەر لەوەی باسی ئاوەدانی ئامێدی بکەین دەبێ ئەوە بزانین کە ئەم شارە دەرفەتی فراوانبوونی سنووردارە بەحوکمی ئەوەی ڕووبەرو پانتایی ئەم شاخەی شارەکەی لەسەر بنیاد نراوە دیاری کراو وجێگیرە.سەرەڕای ئەمەش دەتوانین بڵێین لەماوەی سەردەمی میرنشینی بادیناندا ـ بەتایبەتی لەسەدەی هەژدەم ودواتر ـ لەڕووی ئاوەدانی و ژمارەی دانیشتوانەوە ئامێدی بە یەکێك لەو مەڵبەندانە ئەژمار دەکرا کەبەپێوەری ئەو سەردەمە دەتوانرا ناوی (شار) یان لێ بنرێت لەکوردستاندا.هەر بۆیە مێژوونووسێکی عیراقی لەنامەی دکتۆراکەیدا —کەباسی ژیانی کۆمەڵایەتی عیراق دەکات لەسەردەمی مەمالیکەکاندا(١٧٤٩ـ١٨٣١)- لەنێو شارەکانی کوردستانی عیراقی ئێستا تەنیا (ئامێدی وهەولێر وکەرکوك وسلێمانی و زاخۆ وبەدرە وخانەقین ومەندەلی وئاکرێ) بە شایستەی ئەوە دادەنێ کەپێیان بگوترێت (شار).[3] لەڕاستیدا گوزارشەکانی (ریچ) ی

(١) بڕوانە: ياسين العمري، غاية المرام، ص٩٢; شمس الدين سامي، م . س ، ج٤،ص٣٢٠٦; هێنری بێندەر، س . پ ، ل٢٥٢.

(٢) گەشتی ریچ...، ل١٦٩-١٧٠.

(٣) عماد عبدالسلام رؤوف، الحياة الاجتماعية في العراق ابان عهد المماليك ١٧٤٩-١٨٣١،اطروحة دكتوراه، كلية الاداب جامعة القاهرة ١٩٧٦،ص٣٣.

بەریتانیش لەساڵی ١٨٢٠دا سەبارەت بە دانیشتوانی ئامێدی بەڵگەی ئەوە بەدەستەوە دەدەن، ئەوەتا دەڵێ ئامێدی: "نزیکەی (١٠٠٠) هەزار ماڵی موسڵمان و(٢٠٠) دووسەد ماڵی جوولەکەو (٥٠) پەنجا ماڵە کریستیان و،هەندێ خانەوادەی (یاقوبی) و (ئەرمەنی) تێدایە".[1] ئەگەر هەر ماڵێك بە(٥-٦) کەس دابنێین ئەوا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو کاتە شارەکە زیاتر لە (٧) هەزار سەر دانیشتوانی لەخۆ دەگرت. لەکاتێکدا هەر لەو ماوەیەدا شاری سلێمانی نزیکەی (٥) هەزار وکەرکوکیش نزیکەی (١٠) هەزار کەسی تێدابوو.[2]ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەئامێدی ئەو کاتە شارێکی ئاوەدان بووە.

بێجگە لە ئامێدی کە مەڵبەندی دەڤەری بادینان بوو دیارە دەڤەرەکەش بە گشتی لە ڕووی دانیشتوانەوە قەرەبالغ و ئاوەدان بووە . ئەوەتا لەسەدەی حەڤدەهەمدا (تاڤەرنیێ)ی گەڕیدەی فەرەنسی لە بارەی توانای سەربازی میری بادینان دەڵێ : "دەتوانێ هەشت تا دە هەزار سەرباز کۆبکاتەوە ، وەهێزێك لە پیادە کە زیاتر بێ لەوەی لای هەربەگێکی تر هەیە ، ئەمەش لەبەر قەرەبالغی ناوچەکەی بەدانیشتوان".[3] دیارە لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمیش ئەم دەڤەرە هەر وابووە ، چونکە (فرایزەر) ی گەڕیدەی ئینگلیزی لە گەشتنامەکەیدا بەپێی گوتەی (دکتۆر ڕۆس) ـ کە ئەویش پشتی بەگوزارشی خەڵکی دەڤەرەکە بەستووە ـ دەڵێ بادینان نزیکەی دوازدەهەزار گوندی تێدایە وە لەهەر گوندێکیشدا ٢٠٠ـ٣٠٠ سەر دانیشتوان هەن.[4]

دانیشتوانی بادینان کەبەم شێوەیە لەڕووی ژمارەوە زۆربوون لەهەمان کاتدا لەڕووی ڕەگەز و ئاینیشەوە هەمەجۆر بوون. چونکە لەپاڵ کوردە موسڵمانەکان کوردی ئێزیدی و

---

(١) گەشتی ریچ...، پەراوێزی ل١٦٧.

(٢) عماد عبدالسلام، م . س ، ص٣٥.

(٣) العراق في ألقرن السابع عشر... ،ص١١٨.

(٤) جيمس بيلي فريزر، رحلة فريزر الى العراق في ١٨٣٤،ت:جعفر الخياط،ط١،مطبعة المعارف،بغداد ١٩٦٤، ص١٣. بێگومان ئەم ژمارەیە هەڕەمەکییەو زێدەڕۆیی زۆری پێوە دیارە، لەگەڵ ئەمەشدا بەڵگەی ئاوەدانی دەڤەرەکە بە دەستەوە دەدات.

جولەكە و كریستیان و هەروەها ئەرمەنیشی لە خۆدەگرت[1].وەئەم فرە ڕەگەزی و ئایینی یە تاڕاددەیەكی زۆر لەخودی شاری ئامێدیش ڕەنگی دابۆوە وەك لە گوزارشە رابردوەكەی (ڕیــچ) لەمەڕدانیشــتوانی ئامێــدی بــەدیار دەكــەوێت. بــەڵام وەك هــەر لەوگوزارشــە دەردەكەوێ جوولەكەكان ڕێژەیەكی دیاری دانیشتوانی ئامێدیان پێك دەهێنا لەوماوە یە نێوبراوەدا كەنزیكەی پێنج یەكی كۆی دانیشتوانی شارەكە دە بوو . دیــارە لــە گونــد و دێهاتەكانی دەڤەرەكەش بــە گشــتی ژمــارەی جولەكــەكان كــەم نــەبوو. شــایانی باســە جوولەكەكانش بەكوردی ئاخاوتنیان دەكرد ئەگەرچــی هەنــدێ ووشــەی (عیــبری) شــیان بەكاردەهێنا.[2]

دوای ڕووخانی میرنشینی بادینان وبەتایبەتی لــەنیوەی دووەمــی ســەدەی نۆزدەهــەم بارودۆخ بەم شێوەیە نەمایەوە وبەڵكو لەدواكەوتنیش دابوو.هۆكــاری ئــەم دواكەوتنــەش دەگەڕێتەوە بۆ دەزگاكانی دەولەتی عوسمانی كە لــەدوای ڕووخــانی میرنشــینی بادینــان لەدەڤەرەكـــەدا دامـــەزران، ئـــەم دەزگایانـــەی گەنـــدەڵی كـــارگێڕی و ســـتەمكاری وناسەقامگیرییان لەگەڵ خۆیان بۆ دەڤەرەكە هێنا.(صدیق الدملوجی) كە لەكۆتاییەكانی سەردەمی عوسمانی خــۆی فەرمانبــەر بــوو لــەم ناوچــانە زۆر بــەجوانی ئــەم بارودۆخــە لێكدەداتەوە كاتێ دەڵێ: "ئەم وولاتەی دەكەوێتە دەســتی بیانییــەوە چــاوەڕێی ئــەوەی لێنــاكرێ كــار بــۆ پەرەســەندن وئاوەدانكردنــەوە بكــات، بــەڵكو لــەپێناو بــەهێزكردنی دەســەڵاتی خــۆی، بەشــێوەیەكی ســتەمكارانە حــوكمی دەكــات وتووشــی كاولكــاری دەكات".[3] بێگومان ئەم هۆكارەش كاریگەری لە كەمبوونــەوەی ژمــارەی دانیشــتوانی ئامێدی و هەروەها دابەزینی ئاستی ئاوەدانی شارەكە بەدیار كەوت.

لەئەنجامی ئەمەدا دەبینین لەسەرەتاكانی سەدەی بیستەمدا برایان (ویگرام) لــەبارەی ئامێدییەوە دەڵێن: "ئەم شارۆچكەیە ئێستا تەنیا كۆمەڵێك خانووی خراپە وقەبارەكــەی

---

(١) جليلي جليل ، م . س ،ص١٣.

(٢) بڕوانە : صدیق الدملوجي،امارة بهدينان الكردية أو امارة العمادية، ط٢،مراجعة وتقديم: د.عبدالفتاح علي يحيى، اربيل ١٩٩٩، ص١٣٦ـ ١٣٧.

(٣) م . ن ، ص٧٩ هەروەها ٦٧-٧٩.

لەقـــەبارەی گونـــدێکی گـــەورە زیـــاتر نییـــە".[1]گوتـــەکانی (هێنـــری بێنـــدەر) یـــش کەدەگەڕێتەوە بۆساڵی ١٨٩٥ هەر واپیشان دەدات، ناوبراو کاتێ سەردانی ئامێدی کـرد دەنووسێ: "شار، جگە لەگردێکی گچکەی وێران کەدانیشتوانە کلۆڵـەکانی بەدبەختانـە دەژین، شتێکی دیکە نییە". دواتریش لەبەرامبەر ئـەم وێرانییـەی بەرچـاوی دەکـەوێت خۆی پێ ڕاناگیرێت و دەڵێت : "ئەگـەر شـاریان بەهـەزاران تـۆپیش بۆردوومـان کردبـا هێشتا وەك بارودۆخی ئێستای خراپ نەدەبوو، جاربەجار چاومان بە کۆڵێتێـك دەکـەوێ کە پەناگەی خێزانە هەژارەکانن".[2] بەهەمان شێوە ساڵنامەی موسڵی سـاڵی ١٣١٠ك (١٨٩٢-١٨٩٣ز) ئاماژە بەکەلاوە و وێرانـەی زۆر دەکـات لـەنێو ئامێدیـدا ودەڵێـت ئەمانە پاشماوەی ئەو سەردەمەن کاتێ شار ئەوەندە ئاوەدان بوو کە (٥٠٠٠) ماڵی لەخۆ دەگرت.بەڵام ئێستا تەنیا (١٦٠) خـانوو ئاوەدانـە وئـەوانی تـریش وێرانـەن، تەنانـەت بارەگای حکومەتیش لایەکی کەلاوەیەولایەکی ئاوەدانە.[3] هەروەها لە ساڵنامەی ساڵی ١٣١٢ك(١٨٩٤-١٨٩٥ز) یش باسـی ئـەو شـوێنەوارانە کـراوە کەبەڵگـەی ئـاوەدانی پێشـووی ئامێـدین. بـەڵام ژمـارەی خـانووە ئاوەدانـەکان بەنزیکـەی (٢٠٠) خـانوو قەبڵێنراوە.[4]وەئەگەر ژمارەی ئەندامانی هەر ماڵێك بە(١٠) کەسیش دابنێین ئەوا کۆی گشتی دانیشتوانی ئامێدی لە (٢٠٠٠) سەر تێپەڕ ناکـات، لەکاتێکـدا لەهـەمان ئـەو ماوەیەدا لەکتێبی (قاموس الاعلام) دا ژمارەی دانیشتوانی ئەم شارە بە (٥٠٠٠) کەس لەقەڵەم دراوە.[5]بەڵام دیارە ئەم ژمارەیەی دوایی زۆر وورد نییە، چونکە نزیکـەی (١٠)

(١) مهد البشرية...،ص٢٦٦.

(٢) سەفەرنامەی هێنری بێندەر...، ل٢٥٣-٢٥٤.

(٣) سالنامۀ موصل ١٣١٠هـ،مكتوبي ولايت سعادتلو حسن توفيق افنـدي معرفتيلة ترتيب اولنمشـدر ، ص١٧٥. شایانی باسە (هێنـری بێنـدەر) یـش خراپـی بـاری تـەلاری حکومـەت دووپـات دەکاتەوە.بڕوانـە: سەفەرنامەی هێنری بێندەر...،ل٢٥٣.

(٤) سالنامەء ولايت موصل ١٣١٢هـ، مكتوبي ولايت سعادتلو صادق افنـدي معرفتيلـه ترتيـب اولنمشـدر، موصل ولايتي مطبعه سنده باصلمشدر، ص٢٧٦.

(٥) شمس الـدين سـامي، م . س ، ج٤،ص٣٢٠٦.هـەروەها بڕوانـە: فەیسـەل دەبـاغ (وەرگێڕان)،کوردسـتان لەچاپکراوە عوسمانلییەکاندا، بلاوکراوەکانی دەزگای ئاراس ، چ١، هەولێر ٢٠٠٤، ل١١٠.

ساڵ دواتریش هێشتا دانیشتوانی ئامێدی نەگەیشتوونەتە ئەم ژمارەیە، ئەوەتا سالنامەی موسڵی ساڵی ١٣٢٥ك (١٩٠٧-١٩٠٨ز) ژمارەی خانووەکان بە (٤٠٠-٥٠٠) خانوو وە کۆی گشتی دانیشتوان بە (٤٦٠٦) کەس دادەنێ.[1]

سەبارەت بە ڕەگەزەکانی دانیشتوان لە ئامێدی جیاوازییەکی بەرچاو دەبینرێ لە نێوان ئەم سالنامەی دوایی وکتێبی (قاموس الاعلام) کە لە ساڵی ١٣١٤ك (١٨٩٦ ـ ١٨٩٧ز) دا دەرچووە . ئەمەی دوایی دەڵێ نیوەی (٥٠٠٠) سەرەکەی دانیشتوان کوردی موسڵمانن و نیوەکەی تریش بریتییە لە (١٩٠٠) جولەکە و (٦٠٠) کلدانی.[2] لەکاتێکدا لەسالنامەی نێوبراودا ـ کە نزیکەی دەساڵ دواتر دەرچووە ـ ڕێژەکە بەم شێوەیە: (٣٨٦٣) موسڵمان و (٦٥٦) کریستیانی کلدانی و (٨٧) جولەکە.[3] لەبەر ئەوەی لەم ماوەیەدا ئاماژەی ترمان لەبەر دەستدا نییە بۆیە نازانرێ تاچ ئاستێك ئەم زانیارییانە جێگەی باوەڕن، بەڵام ئەگەر ڕاست بێ دەتوانین بڵێین ـ لەماوەی ئەم (١٠)ساڵەدا ـ گۆڕانێکی گەورە وناچوون یەك لەڕێژەی ڕەگەزەکانی دانیشتوانی ئامێدی ڕوویداوە، بەجۆرێك موسڵمانەکان بەڕێژەی ٥٠٪ زیاد بووینە ،ولەبەرامبەریشدا لە(١٩٠٠) جولەکە تەنیا (٨٧) کەسیان لێ ماوە ،وە ڕێژەی کلدانەکانیش لەچاو خۆی زۆر نەگۆڕاوە بەڵام بە بەراورد لەگەڵ ڕێژەی جولەکە نزیکەی ٧٥٠٪ زیاتر بووە ،لەکاتێکدا پێشتر کلدانەکان نزیکەی ٣\١ ی جولەکەکان بوون لەم شارەدا. لەڕاستیدا ئامارەکەی (قاموس الاعلام) سەبارەت بەژمارەی جولەکەکان لە ئامێدیدا ئەگەر زێدە ڕۆییشی تێدا کرابێ، بەڵام دەبێ تاڕاددەیەك لەڕاستییەوە نزیك بێ، چونکە (هێنری بێندەر) کە لەساڵی ١٨٩٥ دێتە شارەکە تێبینی زۆریی ژمارەی جولەکەکان دەکات ودەڵێت: "سەرەوەی شار جگە لە جووان کە بەشی زۆری دانیشتوان پێك دێنن کەسی دیکەی لێناژی".[4] بەڵام نازانرێ لەبەرچی لەم چەند ساڵەی دواتردا ژمارەیان بەم شێوەیە کەم بۆتەوە.هەرچۆنێك بێت دیارە جولەکەکان بەهۆی پێکەوە ژیانیان لەگەڵ

(١) موصل ولايتي سالنامة رسميسيدر ١٣٢٥ هـ ،ص١٩٦.

(٢) شمس الدين سامي، س . پ ،ج٤، ص٣٢٠٦ .

(٣) موصل ولايتي سالنامة رسميسيدر ١٣٢٥ هـ ، ص١٩٦.

(٤) سەفەرنامەی هێنری بێندەر...، ل٢٥٤.

کورده موسڵمانەکان پەیوەندی زۆریان لەگەڵیاندا پەیدا کردبوو "بەڵام ئەم پەیوەندییە لەڕێی شووکردنی ژنە جووەکان بە موسڵمانان دروست بووە" وەك (هێنری بێندەر) ئاماژەی پێ دەکات.[١]

بۆ ئەوەی لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا ئاستی ئاوەدانی وژمارەی دانیشتوانی ناوچەکانی سەر بەئامێدی بزانین دەبێ ڕەوشی کارگێڕی ئامێدی بەدیار بخەین کە ئەویش بەم شێوەیە بوو; دوای ڕووخانی میرنشینی بادینان ئەم شارە بووە پاشکۆی ئەیالەتی موسڵ، دوای ئەمەش لەساڵی ١٨٤٩ کرایە قەزایەك لەلیوای هەکاری سەر بە ویلایەتی وان، ئنجا لەساڵی ١٨٦٩ گەڕایەوە سەر موسڵ ودواتریش لەساڵانی ١٨٨٣ تا ١٣١٠ك (١٨٩٢-١٨٩٣ز) سەر بە لیوای هەکاری بوو لەویلایەتی وان.[٢] لەم ماوەیەدا لەپێنج ناحیە پێك دەهات [٣] (٣٦٦) گوند و(٢٣٩٤٠)سەر دانیشتوانی لەخۆ دەگرت.[٤] ئەوانیش بەم شێوەیە دابەش دەبوون: (٨٦٠) تورکی عوسمانی، (١٣٦٨٠) کوردی موسڵمان، (٣٠٠٠) کریستیانی نەستوری، (٣٠٠٠) کریستیانی کلدانی، (١٩٠٠) جولەکە، (١٥٠٠)کوردی ئێزیدی.[٥] لەم بەروارەی دواییشەوە تاکۆتایی سەردەمی عوسمانی مەڵبەندی قەزایەك بوو سەر بە لیوای ناوەند لەویلایەتی موسڵدا.[٦]وە بەپێی ساڵنامەی ساڵی ١٣١٢ ك (١٨٩٤ـ١٨٩٥ ز) قەزای ئامێدی لەسێ ناحیە پێك دەهات کە بریتی بوون لە ناحیەکانی ئامێدی و داودیە و بەرواری باڵا، بە هەموو

---

(١) هـ . س ، ل٢٥٤.

(٢) عباس العزاوي، العمادية في مختلف العصور، تحقيق: حمدي عبدالمجيد السلفي وعبدالكريم فندي، ط١، مطبعة وزارة الثقافة، هەولێر١٩٩٨،ص١٨.

(٣) ئەم ناحیانە دەبێ ئەمانە بووبن: ناحیەی ئامێدی(ناوەند)، بەرواری باڵا، بەرواری ژێر، نێروە، ڕێکان. بڕوانە: هـ . س ، ل١٨.

(٤) شمس الدين سامى، م . س ،ج٤،ص٣٢٠٦ .

(٥) فەیسەڵ دەباغ، س . پ، ل١١١.

(٦) عباس العزاوي، م . س ، ص١٨; هەروەها بڕوانە: سالنامۀ موصل ١٣١٠هـ،ص١٧٥; سالنامەء ولايت موصل ١٣١٢هـ،ص٢٧٦; موصل ولايتي سالنامة رسميسيدر ١٣٢٥ هـ، ص١٩٦.

قەزایەکەش (١٢٨٢٢) موسڵمان و (١٠٠٧) کریستیانی کاسۆلیکی و (٢٨) کریستیانی پرۆتستانت و (٢٢١) جولەکەی لەخۆ دەگرت.[1]

هەرسەبارەت بە دانیشتوانی ئامێدی و دەڤەری بادینان بەگشتی دەبێ ئاماژە بە هەڵوێستی نادۆستانەی مێژوونووسێکی سەدەی نۆزدەهەم بکەین کەجێگەی سەرنج و لەسەر ڕاوەستانە . ئەویش (یاسین عومەری ) یە بەتایبەتی لەکتێبی (غرائب الاثر) دا کە هێرشێکی توند دەکاتە سەرخەڵکی بادینان بەگشتی وتەنانەت هەموو چیانشینەکانیش، وە چەندین کارو ڕەفتاری نابەجێیان دەخاتە پاڵ وچەندەها پەندی دروستکراو وهۆنراوەی گاڵتەجاڕی بۆ ئەم مەبەستە دەخاتە ڕوو.[2] شایانی باسە (صدیق الدملوجی) ئەم هەڵوێستەی گەڕاندۆتەوە بۆ خۆڕەپێشکردنی (یاسین عومەری) لەبنامالەی جەلیلیەکانی دەسەڵاتداری موسڵ کەماوەیەك پەیوەندیان لەگەڵ میرنشینی بادینان ئاڵۆز ودژوار بوو، دیارە ناوبراو هەوڵی داوە لە ڕێگەی دژایەتی کردنی دوژمنانی جەلیلیەکان ڕێز وبەخشیشی ئەمانەی دوایی بۆ خۆی دەستەبەر بکات و لە ژێر سایەی ئەواندا بحەسێتەوە.[3]

## ج- لایەنی ئابووری:

شاری ئامێدی بەناوچەکانی دەوروبەرییەوە لەڕووی ئابووریشەوە بایەخی کەم نەبوو، ئەمەش بە هۆی بڕشتی بەروبوومی کشتوکاڵی ڕەز وباخەکانی ودەوڵەمەندی بەسامانی کانزایی وهەروەها بایەخ وپەیوەندییە بازرگانییەکانی وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد.بێگومان ئەم گرنگی وبایەخە ئابوورییەی ئامێدی زۆر بەئاشکرا لەگەشتنامە و سەرچاوە مێژووییەکانی سەدەی نۆزدەهەم هەستی پێکراوە و ئاماژەی بۆ کراوە. هەروەکو لێرە بەدوا لەچوارچێوەی ئەم بابەتانەی خوارەوە دەیخەینە ڕوو:

---

(١) سالنامەء ولایت موصل ١٣١٢هـ، ص١٥٠، ٢٧٦.

(٢) بڕوانە : غرائب الاثر ، ص١٠٠ـ ١٠١، ١٠٨ ،غاية المرام، ص٩٧-٩٨.

(٣) امارة بهدينان...، ص٢١ـ٢٢ .

## ١-كار وپيشەی دانيشتوان:

ساڵنامەكانی موسڵی عوسمانی ئاماژە بەوە دەكەن كە زۆربەی خەڵكی ئامێدی وناوچەكانی دەوروبەری بژێوی ژيانيان لەسەر كشتوكاڵ كردن بووە.[١] خاكەكەشی بەپيت وبەرەكەت بوو.[٢] ئەمەش لەزۆری ژمارەی گوندەكان لەناوچەكانی سەر بەئامێدی بەديار دەكەوێت، ئەوەتا هەر ساڵنامەكان ئاماژە بەوە دەكەن كە لەخودی ناحيەی ئامێدی (٦٠) گوند هەبووە ولەناحيەی (داوديە) ی سەر بەقەزای ئامێديش (٨٠-٩٠) گوند هەبوونە كە(٥-٦) يان وێران بوونە وئەوانی تريش ئاوەدان بوونە.[٣] بەڵام ديارە لەبەر ئەوەی دەڤەرەكە بەگشتی ناوچەيەكی شاخاوی سەخت بوو بۆيە بەشێكی خاكی ئەم دەڤەرە بەكەڵك كشتوكاڵ كردن نەدەهات وەك سەرچاوە عوسمانيەكانی كۆتايی سەدەی نۆزدەهەم ئاماژەی پێ دەكەن.[٤] ئيتر بەرتەسكی زەوييە كشتوكاڵييەكان وايكردبوو كێڵگەی چاندنی دانەوێڵەی وەك گەنم وجۆ ـ كەڕووبەری فراوانيان دەوێ ـ زۆر پەيدا نەبێت وخەڵك زياتر بايەخ بەرەز وباغ وچاندنی داری بەبەر بدەن كە لەقەدپاڵی شاخەكان و زەوييە تەلان ولێژەكانيش ئەنجام دەدرێت.

ئاماژە و زانياری زۆربەی سەرچاوەكان ڕاستی ئەم بۆچوونەی سەرەوە بەديار دەخەن; ئەوەتا (محمد امين عومەری) دەڵێ ئامێدی "چەندەها گوندی ئاوەدانی هەيە، وگەورەيی و فراوانی ڕەزو باخەكانی نكوڵييان لێناكرێ".[٥] هەروەها (ياسين عومەری) براشی لەوەسفی هەندێ ناوچەی سەر بەئامێديدا دەڵێ: "داری زۆريان تێدايە لەهەموو جۆرەكانی بەروبووم وميوە".[٦] ديارە لەكۆتايی سەدەی نۆزدەميش خەڵكی ئامێدی زۆربەيان خاون ڕەزو باغ بوون، لەبەر ئەوەی (هێنری بێندەر) كەلەساڵی ١٨٩٥دا دەچێتە

---

(١) سالنامەء ولايت موصل ١٣١٢هـ، ص٢٧٦.

(٢) سالنامةء موصل ١٣١٠هـ،ص١٧٥.

(٣) سالنامةء موصل ١٣١٠هـ،ص١٧٥; سالنامەء ولايت موصل ١٣١٢هـ، ص٢٧٧.

(٤) فەيسەڵ دەباغ، س ، پ، ل١١١.

(٥) منهل الاولياء ، ج١، ص٦٧.

(٦) غاية المرام، ص٩٦.

ئەم شارە تێبینی ئەوە دەکات کە "باغەکانی زۆر دڵگیرن" و دەڵێ: "خەڵك، شاریان بەجێ هێشتووە ولەناو باغان[کات] بەسەر دەبەن".[1]

بەهۆی ئەم ڕەز وباغە زۆرەوە دەڤەری ئامێدی لەماوەی سەدەی نۆزدەهەمدا جۆرەها بەروبووم ومیوەی بەرهەم دەهێنا لەوانە(برنج وگەنم وجۆ وگەنمەشامی وبادام وگوێز وسماق وزەیتون وهەنجیر وهەنار هەرمێ وتوو وخۆخ وزەردەلوو وسێو وترێ وتووتن ولۆکە) کەناویان لەهەندێ سالنامەی عوسمانی [2]وکتێبی (قاموس الاعلام) دا هاتووە.[3] شایانی باسە ئەم سەرچاوەی دوایی دەڵێ ئەم بەروبوومانە زۆر باشن وتووتن ولۆکەش بەڕێژەیەکی زۆر لەوێ بەرهەم دەهێنرێ.[4] هەروەها (یاسین عومەری)یش بەچاکی وبۆن خۆشی ئەو تووتنەدا هەڵدەدات کە لەزۆربەی ناوچەکانی سەر بەئامێدی دەهێنرایە بەر.[5] جێگەی سەرنجە "تووتنی ئامێدی" هەر بەم ناوەی تەنانەت لەئێرانیش بەناوبانگ و ناسراو بوو،[6] هەنگوینی ئامێدییش بەهەمان شێوە.[7] لەپاڵ هەموو ئەمانە لەهەندێ سالنامەی عوسمانیدا هاتووە کە خەڵکی ئامێدی کرمی ئاوریشم لەسەر داری توو پەروەردە دەکەن بۆ بەرهەمهێنانی کوتاڵی ئاوریشم ولەو ڕێیەوە سالانە نزیکەی (٥-١٠) هەزار قڕوشیان دەست دەکەوێت.[8]

کارامەیی ولێهاتوویی خەڵکی ئامێدی ودەوروبەری لەبواری کشتوکاڵدا لەوە بەدیار دەکەوێ کەفێری هەندێ جۆری پیشەسازی خۆراکی ببوون، وەك ووشك کردنەوەی هەندێ

---

(١) سەفەرنامەی هێنری بێندەر...، ل٢٥٢. هەروەها بڕوانە: شمس الدين سامی، م . س ،ج٤، ص٣٢٠٦ .

(٢) سالنامۀ موصل ١٣١٠هـ،ص١٧٥; سالنامەء ولايت موصل ١٣١٢هـ،٢٧٦.

(٣) شمس الدين سامي، م . س ، ج٤،ص٣٢٠٦ .

(٤) م . ن، ج٤، ص٣٢٠٦، هەروەها بڕوانە: عباس العزاوي، م . س ، ص١٨.

(٥) غاية المرام، ص٩٤.

(٦) يعقوب سركيس،مباحث عراقية /في الجغرافية والتأريخ والآثار وخطط بغداد... الخ ، ق٢، شركة التجارة والطباعة المحدودة، بغداد ١٩٤٨،ص١٥٠.

(٧) عباس العزاوي، م . س ، ص١٠٧.

(٨) بۆ نموونە بڕوانە: سالنامەء ولايت موصل ١٣١٢هـ، ص٢٧٦-٢٧٧.

جۆری بەروبوومی وەك هەنجیر وتریێ بۆ پاراستنی وهەناردنی بۆ دەرەوە.[1] هەروەها دروست کردنی هەندێ جۆری شەربەت وشیرنەمەنی وەك (یاسین عومەری) باسیان دەکات و سەرسامی خۆی بەرامبەریان دەردەبڕێت.[2]

هاوکات لەگەڵ ئەمانەدا بەشێکی خەڵکی ئامێدی بەپیشەی ترەوە خەریك بوون وەك ڕستن وچنین. ئەوەتا (هێنری بێندەر) ی فەرەنسی کاتێ لەئامێدی بوو تێبینی ئەوەی کرد کە"ئیش وکاری خەڵك ڕستن وچنینە"، باسی ئەوەش دەکات کە لەکەلێنی دەرگای مالێك بینیویەتی ژنان بەشێوەیەکی سەرەتایی جۆرە قوماشێك دروست دەکەن.[3] بێگومان کەسانێکیش هەبوون کەپیشەیان دروست کردنی ڕەژوو بوو لەدار بۆ ئەوەی بیفرۆشنە ناوچەکانی دەوروبەر وەك دواتر باسی دەکەین.

مەسەلەیەکی بەڵگەنەویستە کەپیشەی بەشێکی تری دانیشتوانی ئامێدی بازرگانی و کڕین وفرۆشتن بوویێت، لەم بارەیەوە (هێنری بێندەر) ئاماژە بەهەبوونی بازرگانان وکاروانسەرا وهەروەها بازاڕێکی گچکە دەکات لەئامێدیدا ودەڵێ: "لەبەرانبەر تینی هەتاودا بەساباتی لەچروو دروست کراو پارێزراوە".[4] هەر سەبارەت بە بازاڕ لە (قاموس (قاموس الاعلام) دا هاتووە کە لەئامێدی (٨٠) دوکان هەبوو.[5] بێگومان هەبوونی کاروانسەراش بەڵگەی ئەوەیە کەبازرگانانی دەرەوە ڕوویان لەم شارە کردووە بەمەبەستی بازرگانی.

هەر سەبارەت بە بازرگانی زۆربەی سەرچاوەکانی سەدەی نۆزدەهەم ئاماژە بەوە دەکەن کە ئامێدی و ناوچەکانی دەوروبەری چەندین بەروبوومیان بە ڕێژەیەکی لە خۆیان زیاتر بەرهەم دەهێنا ودەنێردرایە هەرێم و وولاتانی دەوروبەر. ئەوەتا لەکتێبی (سیاحتنامە حدود) ـ کە سەرچاوەیەکی عوسمانی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمە ـ داهاتووە کە بەروبوومەکانی ئاکرێ و ئامێدی دەفرۆشرێتە هۆزەکان لە ڕەواندز و

---

(١) بڕوانە: شمس الدين سامی، س . پ ،ج٤،ص٣٢٠٦ .هەروەها: فەیسەڵ دەباغ، س . پ، ل١١١.

(٢) غاية المرام، ص٩٤.

(٣) سەفەرنامەی هێنری بێندەر...، ل٢٥٤، ٢٥٥.

(٤) هـ . س، ل٢٥٥.

(٥) شمس الدين سامی، م . س ،ج٤، ص٣٢٠٦.

دەوروبەری.[1] هەروەها (شمس الـدين سـامی ) يـش بـاس لـەوە دەكـات كـە زۆربـەی بەروبوومەكانی ئامێدی بۆ (باشـقەلاّ) دەنێـردرێ لـە هـەرێمی هـەكاری.[2] بەتايبـەتی هەنجیری ووشككراوە و مێوژ و توتن و برنج و جۆ.[3]

بێگومان كارێكی ئاسايی بوو كە بەشـێكی گرنگـی بەروبوومـەكانی دەڤەرەكـە لـە بازاڕەكانی موسليش ساغ بكرێتەوە، بەتايبەتی كە گەڕيدە بيانييەكانيش ئامـاژە بـەوە دەكەن كەئەم شارە تاڕاددەيەكی زۆر پشت بە بەرهەمە كشتوكاڵی و ئاژەڵييەكانی ناوچە شاخاويەكانی دەوروبەری دەبەستێت.[4] لـەم بارەيـەوە (ياسـين عومـەری) باسـی ئـەوە دەكات كە جۆرەها بەروبوومی وەك برنج و مازوو و لۆكە و هەنار و هەنگوين و گـەزۆ و حەلوا لە دەڤەری بادينانەوە بۆ شاری موسڵ دەهـات.[5] تەنانـەت دەتـوانين بڵـێين لـەم ماوەيەدا كاری ئاسنگەر وزێڕنگـەرانی موسـڵ پشـتی بـە خـەڵووزی دەڤـەری بادينـان بەستبوو ئەوەتا لـە دوا سـاڵەكانی سـەدەی هەژدەهـەم بـە هـۆی بـەرپابوونی كێشـەی ناوەخۆيی لە دەڤەری بادينان و كەمبوونەوەی هاتووچۆ لە نێوان موسـڵ و ئـەم دەڤـەرە نرخی دار وخەڵووز لە موسڵ گران بووبـە جۆرێـك كـاری ئاسـنگەران و زێڕنگـەران لـەم شارەدا وەستا.[6]

سەرباری ئەمانەی باسكران هەندێ بەرهەمی دەڤەری ئامێدی دەنێردرايـە وولاّتـانی دەوروبەريش بەتايبەتی ڕوسيا و ئێران كەهاوسێی دەوڵەتی عوسمانی بـوون ، بـۆ نموونـە (شمس الدين سامی) باسی ئـەوە دەكـات كـە مێـوژی ئامێـدی دەگەيشـتە ڕوسـيا.[7]

---

(١) بەڕاگواستن لە: عباس العزاوي، م . س ، ص١٠٧.

(٢) قاموس الاعلام، ج٤ ،ص٣٢٠٦ .

(٣) فەيسەڵ دەباغ، س . پ، ل١١١.

(٤) الاب لويس ساكو (تعريب)، الموصل حسب رحلة بادجر ، مجلة (بين النهرين) ع(٩ـ١٠) س (٣) ١٩٧٥، ص٦٥ـ٦٦; دومنيكو لانزا، م . س ، ص٦٣.

(٩٥٠) غاية المرام، ص٩٦.

(٦) غرائب الاثر،ص٤٨.

(٧) شمس الدين سامي، م . س ،ج٤،ص٣٢٠٦.

هەروەها لەم چەند لاپەرەی پێشوودا ئاماژەمان بەوە کرد کە تووتن وهەنگوینی ئامێدی زۆر بەناوبانگ و بەرەواج بوون لە ئێران .

## ٢- سامانی سروشتی:

بەهەمان شێوە گەشتنامە وسەرچاوەکانی سەدەی نۆزدەم سەرنجی سامانە سروشتییەکانی دەڤەری ئامێدییان داوە وئاماژەیان پێکردووە. لەم بارەیەوە (یاسین عومەری) دەڵێت لەناوچەکانی سەر بە ئامێدی بەتایبەتی لە (هەرور) کانزاکانی زەرنیخ وئاسن وشەمێ یان مۆم هەیە کە ئەو ناوی دەنێ (مومیا).[١] سەرچاوە عوسمانیەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدەمیش باس لەوە دەکەن کە ناوچەی ئامێدی "بەچەند جۆرە کانزایەکی دەگمەن دەوڵەمەندە".[٢] ئەوەتا لەساڵنامەکانی موسڵی ساڵانی ١٣١٠ك و١٣١٢ك وئەوانی تریشدا هاتووە کە لەم دەڤەرە کانزاکانی (مس وکبریت وئاسن و قورقوشم وهی تریش) هەن.[٣] ئەمە لەپاڵ خەڵووزی بەردی کە برایان(وێگرام) ئاماژە بەهەبوونی دەکەن لەشاخەکانی نزیك ئامێدی ودەڵێن: "چەندەها چین لەخەڵووزی بەردی چاك لەزۆربەی ئەم ناوچانە درێژ دەبێتەوە".[٤] هەر ئەو شاخانە بەدارستانی چڕ داپۆشرابوون[٥] کە جۆرەها بەروبوومی سروشتی وەك بەروو وگێوژ ومازوویان بەرهەم دەهێنا.[٦] هەروەها لەسەر گەڵای دارەکانیش گەزۆ پەیدا دەبوو وەك (هێنری بێندەر)

---

(١) غاية المرام، ص٩٣.

(٢) فەیسەڵ دەباغ، س . پ، ل١١١.

(٣) سالنامةء موصل ١٣١٠هـ،١٧٦ ; سالنامهء ولايت موصل ١٣١٢هـ،٢٧٨.

(٤) مهد البشرية...، ص٢٦٦.

(٥) شمس الدين سامي، م . س ،ج٤،ص٣٢٠٦.

(٦) هێنری بێندەر، س . پ، ل ٢٥٠،٢٤٥-٢٥١. دبليو. أي.ويگرام و أدگار. تی. أي. ويگرام، م . س ، ص٢٦٥. شایانی باسە ئەم سەرچاوەی دوایی تەنیا باسی بەروو دەکات بەڵام مەبەستی مازووە چونکە دەڵێ بۆ بۆیەکردنی جل وبەرگ بەکاردێ.

ئاماژەی پێدەکات.[1] بێگومان دارەکانیش لەلایەن خەڵکی دەڤەرەکە چ بۆ ئامادەکردنی ڕەژوو یان وەکو خۆی بۆ چەندین مەبەست بەکار دەهات.

جێگەی سەرنجە ئەم کانزایانە تائەو سەردەمە بەشێوەیەکی ئەوتۆ سوودیان لێ نەبینرابوو کەباس بکرێ،[2] هەرچەندە ساڵنامەکانی موسڵ باسی ئەوە دەکەن کە بەهۆی نەبوونی پارەی پێویست ئەم کانزایانە دەرنەهێنراون[3] بەڵام لەڕاستیدا ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ دواکەوتوویی دەوڵەتی عوسمانی بەپێوەری ئەو سەردەمە هەروەها کەمتەرخەمی بەرپرسانی ئەم دەوڵەتە هەروەك برایان (وێگرام) هەستیان بەمە کردووە.[4] تەنانەت سەرداره عوسمانییەکەی ئامێدیش لەساڵی ١٨٩٥ دا لەبەرامبەر (هێنری بێندەر) دان بەم مەسەلەیە دادەنێ وئاماژە بەوە دەکات کە لای سەرۆکەکانی هەوڵی داوە وپێی ڕاگەیاندوون کە دەرهێنانی ئەم کانزایانە بۆ دەوڵەت زۆر بەسوودە، بەڵام وەك خۆی دەڵێ : "وەرامیان داوەتەوە کەئەم کارە لەشانی ئەو دانییە ولەمەبەدوا نابێ خۆ لەم جۆرە ئیشانە هەڵقورتێنێ".[5]

**دەرەنجـــام:**

ئامێدی کەشارێکی دێرینی کوردستانە ولەشێوەی قەڵایەکی سروشتی هەڵکەوتووە، بۆ چەندین سەدە ناوەندی میرنشینی بادینان بوو.بۆیە لە گەشتنامەو سەرچاوە مێژووییەکان وەبەتایبەتی ئەوانەی سەدەی نۆزدەهەم ـ کەمەبەستی ئەم باسەن ـ زۆر ناوی هاتووە ولە چەندین لایەنەوە باسی کراوە:

لەڕووی هەڵکەوت و بایەخی ستراتیژی و ئابوورییەوە گەشتنامە وسەرچاوەکان ئاماژەیان بەوە داوە کە قەڵای ئامێدی لەنێو دۆڵێکی پڕ دارستان و ڕەزو باغ

---

(١) سەفەرنامەی هێنری بێندەر...،ل٢٥٠.

(٢) برایان (وێگرام) تێبینی کانێکیان کرد کە لەشێوەی درزێك بوو پانییەکەی شەش پێ دەبوو وەدەڵێن لەماوەکانی ڕابردوودا خەڵووزی بەردی لێ دەرهێنراوە.بڕوانە: مهد البشرية..، ص٢٦٦.

(٣) بڕوانە: سالنامة‌ء موصل ١٣١٠هـ،١٧٦ ; سالنامەء ولايت موصل ١٣١٢هـ،٢٧٨.

(٤) مهد البشرية...، ص٢٦٦.

(٥) سەفەرنامەی هێنری بێندەر...، ل٢٥٦-٢٥٧.

هەڵکـەوتووە، ئەمــەش وایکردبـوو ببێتــە ناوەنـدێك بـۆ کۆکردنـەوەی بەروبومــەکانی ناوچەکانی دەوروبەری . هەروەها کەوتبووە سەر ڕێگایەکی بازرگـانی نێـوان ڕەوانـدز و جەزیرەی بۆتان. لەلایەکی تر زۆربەی گەڕیدە ومێژوونووسەکان ئاماژەیان بەبایەخی ئـەم قەڵایە داوە بۆ مەبەستی بەرگری و خۆڕاگریی کردن لەبەرامبـەر شـاڵاوی هێرشـبەراندا. بەڵام لەگوزارشی سەرچاوەکان دەردەکەوێ کە ئامێدی دوای ڕووخانی میرنشینی بادینـان لە ساڵی ١٨٤٢ دا ئەم گرنگییەی جارانی نەماوە .

سەبارەت بە دانیشتوان وباری ئاوەدانیش لەڕێی زانیـاری گەڕیـدە ومێژوونووســەکان زانیمان کەئامێدی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدە دا شارێکی ئاوەدان و گەشاوە بـوو، وە نزیکەی (٧) هەزار سەر دانیشتوانی لەخۆدەگرت ، وەبۆمان بەدیارکەوت کە لـەڕیزی شارەکانی تری کوردستان دابوو لەڕووی فراوانــی و قـەبارەی دانیشــتوانەوە. بـەڵام دوای ڕووخانی میرنشـینی بادینــان ژمــارەی دانیشــتوانی بـەرە بـەرە لەکەمبوونـەوە دابـوو لەبەرامبەریشدا کەلاوە وخانووە وێرانەکان لەزیادبوون دابوون.

وەتایبەت بەلایەنی ئابووریش دەبینین گەڕیدەو مێژوونووسەکان باسی ئەوە دەکەن کە خەڵکی ئامێدی و دەوروبەری بۆ بژێوی ژیانیان پشــتیان بەکشــتوکاڵ کـردن دەبەسـت و زیاتریش بایەخیان بە ڕەزو باغ دەدا، لە ئــەنجامی ئەمــەدا دەیـانتوانی چـەندین جـۆری میوەو بەروبووم بەرێژەیەکی زۆر بەرهەم بێنن و بۆ ناوچەکانی دەوروبەر و تەنانەت ڕوسیا و ئێرانیش بنێرن ، وەك تووتن و هەنگوین و هەنجیر و مێوژ و سماق و هی تـر. هــەروەها بەشێکی دانیشتوان خەریکی بازرگانی و هەندێکی تریش پیشەگری بـوون وەبەتایبــەتی جۆرە قوماشێکیان دروست دەکرد. لەپاڵ هەموو ئەمانە سەرچـاوەکان ئاماژەیـان بـەوە کردووە کە دەڤەری ئامێدی بەهەندێ سامانی سروشتی دەولەمەند بوو، بەتایبەتی ئاسن و مس و قورقوشم وبەرهەمەکانی دارستان.

## سەرچاوەکانی باسی پێنجەم

**یەکەم: چاپکراوی حکومی:**

١- سالنامەء موصل ١٣١٠هـ، مكتوبي ولايت سعادتلو حسن توفيق افندي معرفتيله ترتيب اولنمشدر.

٢- سالنامەء ولايت موصل ١٣١٢هـ، مكتوبي ولايت سعادتلو صادق افندي معرفتيله ترتيب اولنمشدر، موصل ولايتي مطبعه سنده باصلمشدر.

٣- موصل ولايتي سالنامة رسميسيدر ١٣٢٥ هـ، عزتلو صفوت بك معرفتيله ترتيب و دردنجي دفعه اوله رق ، موصل مطبعه سنده طبع اولنمشدر.

**دووەم: گەشتنامەکان:**

**أ – بەزمانی کوردی:**

٤- ئەولیا چەلەبی، کورد لەمێژووی دراوسێکانیدا(یان ـ سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی) و: ناکام، بەغدا ١٩٨٨.

٥- کلودیوس جیمس ریچ، گەشتی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، و:محەمەد حەمە باقی ،چ١، ئێران- تەورێز ١٩٩٢.

٦- هێنری بێندەر، سەفەرنامەی هێنری بایندەر/کوردستان، میزۆپۆتامیا،ئێران، و: ئەبوبەکر خۆشناو، سلێمانی ٢٠٠٦.

**ب- بەزمانی عەرەبی:**

٧- جان باتيست تافرنييه، العراق في القرن السابع عشركما رآه الرحالة الفرنسي تافرنييه،ت: بشير فرنسيس وكوركيس عواد، مطبعة المعارف، بغداد ١٩٤٤.

٨- جيمس بيلي فريزر، رحلة فريزر الى العراق في ١٨٣٤،ت:جعفر الخياط،ط١،مطبعة المعارف، بغداد ١٩٦٤.

٩- دبليو. أي.ويگرام و أدگار. تي. أي. ويگرام، مهد البشرية / الحياة في شرق كردستان، ت:جرجيس فتح الله،ط٣،منشورات دار ئاراس،اربيل ٢٠٠١.

١٠- دومنيكو لانزا، الموصل في القرن الثامن عشر حسب مذكرات دومنيكو لانزا، ت: القس روفائيل بيداود،ط٢، الموصل ١٩٥٣.
١١- كارستن نيبور، رحلة نيبور الى العراق في القرن الثامن عشر ،ت: د.محمود حسين الامين، بغداد ١٩٦٥.

**سێیەم: نامەی دکتۆرا:**

١٢- عماد عبدالسلام رؤووف، الحياة الاجتماعية في العراق ابان عهد المماليك ١٧٤٩-١٨٣١،اطروحة دكتوراه، كلية الاداب جامعة القاهرة ١٩٧٦.

**چوارەم: کتێب:ـ**

**أ- بەزمانی تورکی:**

١٣- حسن دومان، البيبليوطرافيا والفهرس الموحد للسالنامات والنوسالات العثمانية،انقرة ١٩٩٩.
١٤- شمس الدين سامي، قاموس الاعلام ،ج٤،مهران مطبعه سي،استانبول ١٣١٠.
١٥- محمد سعيد المدرس، گلشن معارف ،ج١، استانبول ١٢٠٢هـ.
١٦- هامەر،دولت عثمانية تاريخي،مترجمي: محمد عطا ،ج٩،أوقاف اسلامية مطبعةسي، استانبول ١٣٢٩.

**ب-بەزمانی کوردی:**

١٧- فەیسەل دەباغ (وەرگێڕان)،کوردستان لەچاپکراوە عوسمانلییەکاندا، بڵاوکراوەکانی دەزگای ئاراس ، چ١ ،هەولێر ٢٠٠٤.

**ج- بەزمانی عەرەبی:**

١٨- د.ابراهيم شريف ، الموقع الجغرافي للعراق وأثره في تأريخه العام حتى الفتح الاسلامي،ج٢ ،بغداد (د.ت).
١٩- احمد بن علي القلقشندي (توفي:٨٢١هـ/١٤١٨م)، صبح الاعشى في صناعة الانشا، بيروت ١٩٨٧،ج٤،ج٧.
٢٠- أنور المايي، الاكراد في بهدينان،ط٢،دهوك ١٩٩٩.
٢١- د.بدرخان السندي ، المجتمع الكردي في المنظور الاستشراقي، منشورات دار ئاراس ،مطبعة وزارة التربية، اربيل ٢٠٠٢.

٢٢-جليلي جليل ،م.س. لازاريف، م.أ. حسرتيان، شاكر و محويان، أولغا جيغالينا، الحركة الكردية في العصر الحديث، ت: د.عبدي حاجي،ط١،دار الرازي للطباعة والنشر،بيروت .١٩٩٢

٢٣- جمال بابان،اصول اسماء المدن والمواقع العراقية،ط٢،بغداد.١٩٨٦

٢٤- رسول حاوي الكركوكلي،دوحة الوزراء في تاريخ وقائع بغداد الزوراء، ت: موسى كاظم نورس،مطبعة كرم ،بيروت (د.ت).

٢٥- شرف خان البدليسي،شرفنامة،ت:محمد جميل الملا احمد الروزبياني،ط٢،منشورات مؤسسة موكرياني،مطبعة وزارة التربية ـ اربيل.٢٠٠١

٢٦- صديق الدملوجي،امارة بهدينان الكردية أو امارة العمادية، ط٢،مراجعة وتقديم: د.عبدالفتاح علي يحيى،اربيل .١٩٩٩

٢٧- عباس العزاوي، العمادية في مختلف العصور، تحقيق: حمدي عبدالمجيد السلفي وعبدالكريم فندي، ط١، مطبعة وزارة الثقافة، هەولێر١٩٩٨.

٢٨- عزالدين ابن الاثير(توفي:٦٣٠هـ/١٢٣٣م)،الكامل في التأريخ، دار الفكر، بيروت ١٩٧٨،ج.٩

٢٩- كاوه فريق احمد شاوه لي ئاميدي، امارة بادينان ١٧٠٠-١٨٤٢/دراسة سياسية اجتماعية ثقافية،منشورات مؤسسة موكرياني/ اربيل،مطبعة خبات- دهوك .٢٠٠٠

٣٠- محمد امين بن خيرالله الخطيب العمري، منهل الاولياء ومشرب الاصفياء من سادات الموصل الحدباء، ج١، تحقيق: سعيد الديوةجي،مطبعة الجمهورية، الموصل .١٩٦٧

٣١- نظمي زاده مرتضى افندي،كلشن خلفا، ت: موسى كاظم نورس، مطبعة الاداب ـ النجف .١٩٧١

٣٢- ياسين بن خيرالله الخطيب العمري ، زبدة الاثار الجلية في الحوادث الارضية ، انتخب زبدته: د.داود الجلبي، تحقيق: عماد عبدالسلام رؤوف،مطبعة الآداب، النجف ١٩٧٤.

٣٣- ــــــــــــــــــ، غاية المرام في تاريخ محاسن بغداد دارالسلام،مطبعة دار البصري ،بغداد .١٩٦٨

٣٤- ـــــــــــــــــــــــ،غرائب الاثر في حوادث ربع القرن الثالث عشر،مطبعة ام الربيعين، الموصل ١٩٤٠.
٣٥- يعقوب سركيس،مباحث عراقية /في الجغرافية والتأريخ والآثار وخطط بغداد... الخ، ق٢، شركة التجارة والطباعة المحدودة، بغداد ١٩٤٨.

**پێنــجەم: گۆڤــار:**

٣٦- ميريلا غاليتي ، التراث الكردي في مؤلفات الايطاليين، ت: د.يوسف حبي، (گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق- دەستەی کورد، مج(٨) ١٩٨١.
٣٧- لويس ساكو (تعريب)، الموصل حسب رحلة بادجر ، مجلة (بين النهرين) ع(٩-١٠) س (٣) ١٩٧٥.

## ملخص البحث

## آميدي في كتب الرحلات ومصادر القرن التاسع عشر

ان قلعة آميدي(العمادية) قد ورد اسمها كثيراً في المصادر التأريخية ، وتناولها معظم الرحالة الاجانب الذين سافروا عبر المنطقة ، وذلك لعراقتها وبقائها عاصمةً لامارة بادينان طوال قرون عدة. رغم ان الهدف الدفاعي كان يمثل عاملاً فاعلاً في بناء تلك القلعة ، الا ان موقعها لايخلو من الاهمية الجغرافية — الاستراتيجية. وكان ذلك من الجوانب المهمة التي جلب انظار المؤرخين والرحالة ، فأعجبوا بمناعة قلعة آميدي وموقعها . ففي هذا الصدد يذكر احد الرحالة : (تتمكن هذه القلعة من خلال بضعة مدافع صغيرة الحجم من الصمود تجاه اية قوة آسيوية كبيرة). ولكن بعد سقوط امارة بادينان تراجعت اهمية هذه القلعة من الناحيتين السياسية والعسكرية. وفيما يتعلق بألناحية العمرانية فيمكن القول بأنه خلال عهد الامارة كانت آميدي تعد من المراكز الحضرية التي يمكن اطلاق صفة المدينة عليها في كردستان. ووفقاً لمعلومات المقيم البريطاني (ريج) نستنتج بانها كانت تضم في عام ١٨٢٠ حوالي (٧٠٠٠) نسمة. ولكن في اواخر القرن التاسع عشر لم تكن تحتو الا على (٥٠٠٠) شخص وفقاً لبعض المصادر العثمانية . وكانت لمدينة آميدي ومناطقها المجاورة اهمية اقتصادية ملحوظة ايضاً، اذ تشير المصادر العثمانية العائدة لنهاية القرن التاسع عشر الى غنى المنطقة بانواع عدة من المعادن (كالنحاس والكبريت والحديد والرصاص والفحم الحجري) كما لاحظ الرحالة ان معظم اهالي المنطقة كانوا يمتلكون البساتين وكانوا يصدرون انواعاً من محاصيلهم الزراعية الى المناطق والبلدان المجاورة .

***Abstract***

## Amedi in the historical sources and traveler books in 19th century

Amedi is one of the oldest citadel in Kurdistan, and it was for centuries capital of Badinan Emirate, for this reason its name mention in historical sources, and many foreign travelers interested in this citadel. Its clear that the building of Amedi was for the military purpose in the beginning, but also this citadel had a strategically and economical role. This fact was made many of travelers interested in this citadel and praised its defendable position. But after the fallen of Badinan emirate, this citadel lost its military and political role in Kurdistan.

In the other side Amedis population was large in 19th century, for this reason we can say Amedi was not a castle but it was a citadel. According to the (K.J.Rich) s information, we can concludes that more than (7000) people are leaved in Amedi in 1820. But after the fallen of the emirate this number are decline to (5000) according to Ottoman sources. In the economic side the historical sources improved that region of Amedi was very important. According to the Ottoman sources in the end of 19th century this region was rich with some kind of metals like (copper, iron, lead, sulphur, charcoal). Also we can see that most of Amedis people had a groves, and they are export some kind of fruits to the adjacent regions and countries.

## دەڤەری ماردین لەچەند کتێبێکی (یاسین عومەری) دا*
## توێژینەوەیەکی مێژوویی شرۆڤەکاری بەراووردکارییە

**پێشـــەکی:**

دەڤەری ماردین بەدرێژایی چوار سـەدەی حـوکمڕانی عوسمـانی چـەندین هـەوراز و نشێوی بەخۆوەبینی و بەپێی سەنگ و ڕۆڵی خۆی چەندین لاپەڕەی لەمێژوودا نەخشـاند. هەندێ لەو لاپەڕانەی مێژووی ماردین لەلایـەن مێژوونوسـە عیراقییـەکانی سـەردەمی عوسمـانی تۆمـارکراون. بەتایبـەتی یاسـین عومـەری (١٧٤٥- ١٨١٦)، کـە کتێبـە مێژووییەکانی لەم لایەنەوە دەوڵەمەند و پڕلـەزانیارین. بـەجۆریك دەتـوانین بڵـێین ئـەم کتێبانە بەسەرچاوەی ڕەسەن و بەبایەخ دادەنرێن بۆ مێژووی دەڤـەری مـاردین. چـونکە لەلایەك ئەم مێژوونوسە هاوچـەرخی قۆنـاغێکی مێـژوویی ئـەم دەڤەرەیـە کـەپڕ بـوو لەڕووداو وگۆڕانکـاری. لەلایـەکی تـریش نیشـتەجێی موسـڵ بـوو کـە وەك ئاشـکرایە لەماردینەوە نزیکە.

لـەم توێژینەوەیـە هەوڵـدەدەین ئـەم زانیارییانـەی کەتایبـەتن بەمێـژووی مـاردین لەسـەردەمی عوسمانیـدا لەکتێبـەکانی عومەریـدا دەستنیشـان بکـەین، بەتایبـەتی لەکتێبەکانی: (الآثار الجلية في الحوادث الارضية) و (غرائـب الأثـر في حـوادث ربـع القـرن الثالـث عشـر) و (غايـة المـرام في تـأريخ محاسـن بغـداد دارالسـلام)، کـە لـەم بارەیـەوە بەکەلکن. ئنجا ئەم زانیارییانە بەپێی پەیوەندییان بەلایەنەکانی ئاوەدانی و کـارگێڕی و سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایـەتی، دەخەینـەڕوو. بۆئـەوەی شـیکردنەوەیان بـۆ بکـەین.

---

* نووسەر بەم باسە بەشداری لەسیمپۆزیەمێکی نێودەولەتی کرد لەبارەی (میدیات)، کە لەڕۆژانی ٧- ٢٠١١/١٠/٩ لەکوردستانی باکور (تورکیا) بەسترا. دواتریش وەکو توێژینەوەیەکی ئەکادیمی، بەپێی نووسراوی ژمارە ١٣٨ لەڕێکەوتی ٢٠١١/١١/٢١ لەگۆڤاری (ئەکادیمی) وەرگیرا بۆ بڵاوکردنەوە.

نەخۆشییەکە لەوێوە پەڕیوەتەوە بۆ موسڵ ولەوێ کارەساتێکی ترسناکی ناوەتەوە.[1] ئەم کارەساتە هەر بەوە نەوەستاوەو لەناوچەکانی باشوری کوردستان وهەروەها بەغدا ش بڵاوبۆتەوە.[2] شایانی باسە هەندێ سەرچاوەی تریش باسی بڵاوبوونەوەی ئەم پەتایە دەکەن لەناوچەکەدا، بەڵام زانیاریمان لەبارەی ماردین نادەنێ.[3] تەنانەت خودی یاسین عومەریش لەشوێنێکی تر باسی ئەم ڕووداوە دەکا بەڵام ئاماژە بە ماردین ناکا.[4]

بەپێی گوتەی عومەری دوای تێپەڕبوونی پێنج ساڵ بەسەر ئەم کارەساتە تەندروستییە، گرانی وقاتوقڕی چەندین ناوچەی ئیالەتەکانی ڕۆژهەڵاتی دەولەتی عوسمانی گرتۆتەوە. ئەم تەنگژە ئابورییە لەهەر ناوچەیەك هۆکاری خۆی هەبوو. سەبارەت بەماردین، عومەری هۆکارەکەی دەگێڕێتەوە بۆ خراپەکاری هۆزەکان وکەمی بەروبوومی کشتوکاڵی. بۆ (نسێبین)یش تێکچوونی ڕەوشی ئاسایش بەهۆکار دادەنێ.[5] هەر لەڕێگەی زانیارییەکانی ئەم مێژوونووسەوە دەزانین کە لەساڵی ١٢٢٤ك (١٨٠٨-١٨٠٩ز) گرانیەکی زۆر دژوار لەماردین لەئارادابوو بەجۆرێك دەستکەوتنی کەلوپەلی خۆراکی زۆر سەخت بوو. ئەمەش بەهۆی ئاژاوەو شەڕی هۆزەکان لەگەڵ یەکتر وتاڵانکردنی بەروبوومی ناوچەکە لەلایەن هێزەکانی بەغدا.[6] لەم زانیارییانەی عومەری عومەری دەردەکەوێ کە ئەم نائارامی وئاژاوانەی لەم ماوەیەدا لەدەڤەرەکە بەرپابوون کارەساتی ئابوری ترسناکیان لێکەوتۆتەوە. ئەم هەڵمەتە سەربازییەی سلێمان پاشای بچووکی والی بەغداش کە بەبیانووی گێڕانەوەی سەقامگیری کرایەسەر دەڤەرەکە، ڕەوشەکەی بەئاقارێکی خراپتردا برد.

---

(١) م . ن ، ص٥٤، منية الادباء، ص١٩٢.

(٢) بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم پەتایە بڕوانە: سەعدی عوسمان هەروتی، تەنگژە ئابوری و...، ل١٠٩-١١٠.

(٣) بڕوانە: كلوديوس جيمس ريج، رحلة ريج في العراق عام١٨٢٠،ت: بهاءالدين نوري، ج١، بغداد١٩٥١، ص٣١٧، رسول الكركوكلي، م . س، ص٢١٦، ستيفن لونكريك، م . س، ص٢٥٠.

(٤) منية الادباء، ص١٩٢.

(٥) غرائب الأثر، ص٦٨.

(٦) م . ن ، ص١٠٠.

بەر لەوەی کۆتایی بەم باسە بێنین دەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە لەساڵانی ١٧٥٦-١٧٥٧ دا لەئەنجامی هەندێ هۆکاری سروشتی کارەساتێکی مرۆیی کەم وێنە لەناوچەکەدا ڕوویدا. ئەم کارەساتە کە خۆی لەبرسێتی وقاتوقڕییەکی ترسناکدا دەبینیەوە، لەناوچەکانی دیاربەکرەوە تا موسڵ و دەوروبەری گرتەوە.[١] کەواتە ئاساییە کە ماردینیش تووشی ئەم کارەساتە بووبێ، وەك لەهەندێ سەرچاوەدا بەڕوونی ئاماژەی پێدەدرێ.[٢] بەڵام جێگەی سەرسوڕمانە کە عومەری ڕاستەوخۆ ئاماژە بەدەڤەری ماردین ناکا، هەرچەندە لەچەند کتێبێکیدا باسی ئەم کارەساتە دەکا.[٣] بێگومان ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە بەپێی زانیارییەکانی ئەم مێژوونووسە دەڤەری ناوبراو دوور بووە لەم کارەساتە، چونکە عومەری لەسەرەتای باسکردنی ڕووداوەکە دەنووسێ: "کارەساتەکە دژوار بوو، لێقەومانەکە مەزن بوو، گرانی عەجەم وعەرەب وهەموو وولاتانی گرتەوە".[٤] کەواتە ئەو بەشێوەیەکی گشتی ئاماژەی بەناوچە تووشبووەکان داوەو لەبەر فراوانی ناوچە جوگرافییەکە بەپێویستی نەزانیوە کە شار بە شار و ناوچە بە ناوچە ناویان بهێنێ.

## پوختەی توێژینەوەکە:

یاسین کوڕی خەیروللای عومەری (١٧٤٥-١٨١٦) کە خەڵکی (موسڵ) ـە، لەو مێژوونووسە عیراقییە دەگمەنانەی سەردەمی عوسمانییە، کە کتێبەکانیان گشتگیر و پڕ لە ووردەکارین. ئەم مێژوونووسە لەکتێبە مێژووییەکانی، بەتایبەتی (غرائب الأثر) و(الآثار الجلية) زانیاری زۆری لەبارەی ووڵات و ناوچەکانی دەوروبەر تۆمار کردووەو تەنیا بایەخی بەڕووداوەکانی موسڵ یان ئەیالەتەکانی عیراق نەداوە، هەروەکو زۆربەی

---

(١) جعفر الخياط، مشاهدات الدكتور ايفز بين بغداد وكركوك والموصل، الاقلام (مجلة) ج (١٢) س (٢) آب ١٩٦٦، بغداد، ص٤٧.

(٢) دومنيكو لانزا، م . س، ص٤٣، جعفر الخياط، صور من تأريخ العراق في العصور المظلمة، ج١، ط١، دار الكتب، بيروت ١٩٧١،ص١٦٠. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم ڕووداوە بڕوانە هەمان دوو سەرچاوە.

(٣) زبدة الآثار، ص١١٢-١١٥، منية الادباء، ص١٨٣-١٨٤.

(٤) زبدة الآثار، ص١١٢.

مێژوونووسە عیراقیەکانی ئەم سەردەمە وایاندەکرد. لەئەنجامدا عومەری کەرەستەیەکی بەکەلکی جێهێشتووە بۆ نووسینەوەی مێژووی ئەیالەتە عوسمانیەکان لەزۆربەی لایەنەکانەوە.

ڕووداوەکانی دەڤەری (ماردین) یش جێگەی سەرنجی عومەری بوون، بەتایبەتی کە ئەم دەڤەرە لەموسڵ نزیکە و لەڕووی کارگێڕیشەوە لەم ماوەیەدا سەر بە ئیالەتی بەغدا بوو. بۆیە کتێبەکانی عومەری بەتایبەت (غاية المرام) هەندێ زانیاری تێدایە سەبارەت بەباری ئاوەدانی ماردین. هەر ئەم کتێبە لەگەڵ هەردوو کتێبی (غرائب الأثر) و(الآثار الجلية) هەواڵی زۆریان تێدایە لەبارەی ئەو گۆڕانکاریە کارگێڕییانەی کە والی بەغدا لەپۆستی سەرداری ماردین (Voyvoda) دەیکرد. هەروەها ئەو ئاژاوە ناوخۆییانەش لەخۆدەگرن کەبەهۆی ڕاپەڕینی دانیشتووان لەدژی سەرداری دەڤەرەکەیان، یان لەئەنجامی هێرشە سەربازییەکانی ئەیالەتەکانی دەوروبەر و دەستدرێژی هۆزەکان ڕوویان دەدا. عومەری باسی هەندێ کارەسات وقەیرانی ئابوری و تەندروستیش دەکا کە دەڤەری ماردینیان گرتۆتەوە لەم ماوەیەدا. بەتایبەت گرانی و بڵاوبوونەوەی پەتای تاعون. ئەمانە لەگەڵ زانیاری جۆراوجۆری تر،کەزۆربەیان لەسەرچاوەی تردا نابینرێن، هەموویان پێکەوە سیمای مێژوویی دەڤەری ماردین بەدیاردەخەن لەگۆشەنیگای مێژوونووسێکی عیراقی موسڵییەوە.

# سەرچاوەکانی باسی شەشەم


**یەکەم: بەڵگەنامەی بڵاوکراوە:**

-Ayni Ali Efendi (Defteri Hakani Emini-1018/1609): Osmanli Imparatorlugunda Eyalet Taksimati, Toprak Dagitmi ve Bunlarin Mali Gucleri, Bu gunkudile Ceviren:Hadiye Tuncer, Gursoy Basmevi-Ankara 1964.

**دووەم: دەستنووس:**

- جبرائيل حنوش اصفر، منتجع المرتاد في تاريخ بغداد/ او مختصر المستفاد في تأريخ بغداد، (مخطوط) دار صدام للمخطوطات، برقم ١١٠٤.

**سێیەم: کتێب:**

**أ- بەزمانی تورکی:-**

- شمس الدين سامي، قاموس الاعلام ، مهران مطبعه سي، مج٣، استانبول ١٣٠٦، مج٦، استانبول ١٣١٦رومي.

- هامەر، دولت عثمانية تاريخي، مترجمي: محمد عطا، ج٤، استانبول ١٣٣٠ رومي.

**ب- بەزمانی کوردی:-**

- ئەولیا چەلەبی، کورد لەمێژووی دراوسێکانیدا(یان ـ سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی) و: ناکام، بەغدا ١٩٨٨.

-کلوديوس جيمس ريج، رحله ريج فى العراق عام١٨٢٠،ت: بهاءالدين نوري،ج١، بغداد ١٩٥١.

**ج- بەزمانی عەرەبی:**

- ابي طالب خان ، رحلة ابي طالب خان الى العراق واوربا، ت: مصطفى جواد، دار الوراق للنشر، ط١، بغداد ٢٠٠٧.

- اوليفييه، رحلة اوليفييه الى العراق١٧٩٤-١٧٩٦، ت: د.يوسف حيي، بغداد ١٩٨٨.

- بيرسي كيمب، الموصل والمؤرخون الموصليون في العهد الجليلي/١٧٢٦- ١٨٣٤، ت: محب احمد الجليلي و غانم العكيلي، مراجعة الترجمة: صلاح سليم علي، مركز دراسات الموصل، جامعة الموصل ٢٠٠٧.

- جعفر الخياط، صور من تأريخ العراق في العصور المظلمة، ج١، ط١، دار الكتب، بيروت ١٩٧١.

- جعفر الخياط، مشاهدات جون أشر في العراق، فصل ضمن كتاب (رحالة اوربيون في العراق)، دار الوراق للنشر، لندن ٢٠٠٧.

- حسين ناظم بيگ، تاريخ الامارة البابانية، ت: شكور مصطفى و محمد الملا عبدالكريم المدرس، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، اربيل ٢٠٠١.

ـ دومنيكو لانزا، الموصل في القرن الثامن عشر حسب مذكرات دومنيكو لانزا، ت: القس روفائيل بيداود،ط٢، الموصل ١٩٥٣.

- رسول حاوي الكركوكلي، دوحة الوزراء في تأريخ وقائع بغداد الزوراء، ت: موسى كاظم نورس، مطبعة كرم، بيروت(د.ت).

- ريجارد كوك، بغداد مدينة السلام، ت: فؤاد جميل والدكتور مصطفى جواد، ج٢، ط١، بغداد ١٩٦٧.

- ستيفن همسلي لونكريك،اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث،ت:جعفر الخياط، دار الرافدين للنشر، ط٥، بيروت ٢٠٠٤.

- د.سعدي عثمان حسين، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر/ دراسة في علاقتها الادارية والسياسية والاقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل، مطبعة سيما، السليمانية ٢٠٠٦.

- د. سعدي عثمان هروتي، كوردستان والامبراطورية العثمانية/ دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان (١٥١٤-١٨٥١)، مؤسسة موكرياني- اربيل، مطبعة خاني، دهوك ٢٠٠٨.

- سليمان فائق بك، تاريخ المماليك "الكوله مند " في بغداد، ت: محمد نجيب ارمنازي، مطبعة المعارف، بغداد ١٩٦١.

- سهيل قاشا، الموصل في العهد الجليلي ١١٣٩-١٢٥٠هـ/ ١٧٢٦-١٨٣٤، التنوير للطباعة والنشر، ط١، بيروت ٢٠١٠.

- صديق الدملوجي،امارة بهدينان الكردية أو امارة العمادية، ط٢،مراجعة وتقديم: د.عبدالفتاح علي يحيى،اربيل ١٩٩٩.

- عباس العزاوي، تأريخ العراق بين احتلالين، مج٦، شركة التجارة والطباعة المحدودة، بغداد ١٩٥٤.

- عبدالعزيز سليمان نوار، داود باشا والي بغداد، دار الكاتب العربي للطباعة والنشر، القاهرة ١٩٦٨.

- عثمان بن سند الوائلي البصري،مطالع السعود بطيب اخبار الوالي داود/ تأريخ العراق من سنة ١١٨٨ الى سنة ١٢٤٢هـ(١٧٧٤-١٨٢٦م)، تحقيق: د. عماد عبدالسلام رؤوف وسهيلة عبدالمجيد القيسي، دار الحكمة للطباعة والنشر، الموصل ١٩٩١.

- كارستن نيبور، رحلة نيبور الى العراق في القرن١٨، ت:محمود حسين الامين، بغداد ١٩٦٥.

- محمد امين بن خيرالله الخطيب العمري، منهل الاولياء ومشرب الاصفياء من سادات الموصل الحدباء، ج١، تحقيق: سعيد الديوه جي،مطبعة الجمهورية، الموصل ١٩٦٧.
- محمد امين زكي، مشاهير الكرد وكردستان، ج٢، الآثار الكاملة للمؤلف، اعداد: رفيق صالح، السليمانية ٢٠٠٥.
- ياسين بن خيرالله الخطيب العمري ، زبدة الاثار الجلية في الحوادث الارضية ، انتخب زبدته: د.داود الجلبي، تحقيق: عماد عبدالسلام رؤوف،مطبعة الآداب، النجف ١٩٧٤.
- ياسين العمري، غاية المرام في تاريخ محاسن بغداد دارالسلام،مطبعة دار البصري ،بغداد ١٩٦٨.
- ياسين بن خيرالله الخطيب العمري، غرائب الاثر في حوادث ربع القرن الثالث عشر،مطبعة ام الربيعين، الموصل ١٩٤٠.
- ياسين بن خيرالله الخطيب العمرى ،منية الادباء في تأريخ الموصل الحدباء، تحقيق ونشر: سعيد الديوه جي، مطبعة الهدف، الموصل ١٩٥٥.

**چوارەم: ووتار و توێژینەوە:**

- د. سەعدی عوسمان هەروتی، تەنگژە ئابوری وتەندروستیەکانی کوردستان لەسەردەمی عوسمانیدا، (زانکۆ) گۆڤاری زانستە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر، ژ (٤٢) ٢٠٠٩.
- جعفر الخياط، مشاهدات الدكتور ايفز بين بغداد وكركوك والموصل، الاقلام (مجلة) ج (١٢) س (٢) آب ١٩٦٦، بغداد.
- Percy Kemp, Mosuli Sketches of Ottoman history, Middle Eastern Studies, vol.17, no.3, (jul.1981).

## ملخص البحث باللغة العربية

### منطقة ماردين في بعض مؤلفات ياسين العمري

يعد المؤرخ الموصلي ياسين بن خيرالله الخطيب العمري (١٧٤٥-١٨١٦) من المؤرخين العراقيين القلائل خلال العهد العثماني الذين تتميز مؤلفاتهم بالشمولية والتفصيل. اذ دوّن المؤرخ المذكور في مؤلفاته التأريخية (وخاصةً كتابيه: غرائب الاثر و الآثار الجلية) معلومات غزيرة ومفصلة احياناً عن عموم المنطقة، ولم ينحصر اهتمامه بحوادث ايالته أو الايالات العراقية وحدها كما كان يفعل أغلب المؤرخين العراقيين في ذلك العهد. ولذلك ترك لنا العمري معلومات مهمة تخدم كتابة تأريخ الايالات العثمانية من مختلف الجوانب. وخاصةً فيما يتعلق بالربع الأخير من القرن الثامن عشر والربع الاول من القرن التالي.

وحظيت أخبار منطقة ماردين بأهتمام متزايد في مؤلفات ياسين العمري، وذلك لقربها الجغرافي من الموصل، وتبعيتها الادارية لأيالة بغداد خلال الفترة المذكورة. اذ نجد في تلك المؤلفات معلومات عديدة عن التبدلات الادارية العديدة التي كان والي بغداد يجريها في منصب حاكم ماردين والذي كان يعرف بـ (ويوضة voyvoda). وهو مصطلح اداري عثماني ذو اصل ايطالي.كما نقف على الفوضى والقلاقل الداخلية التي حدثت فيها جراء ثورة سكانها على حاكم منطقتهم، أو نتيجة حملات الايالات المجاورة واعتداءات العشائر القاطنة في المنطقة.وكذلك يتطرق العمري في مؤلفاته التأريخية الى بعض الكوارث والازمات الاقتصادية والصحية التي اصابت ماردين خلال تلك الفترة وخاصةً حوادث المجاعة والغلاء وتفشي الاوبئة الفتاكة كالطاعون. وذلك الى جانب معلومات متنوعة أخرى تساهم بمجملها في معرفة ملامح منطقة ماردين التأريخية خلال ذلك العهد وفق رؤية عراقية موصلية.

## *Abstract*

## Mardin region in the Yãsìn al-Ûmaries authoresses

The historiographer of Mosul Yãsìn al-Ûmari (1745-1816), is one of the rare Iraqi historiographers in the Ottoman period, who their authoresses is comprehensiveness and detailing. This historiographer, chronicled in his historical authoresses – Especially in his two books: (Gharãib al-Àthar) &(al-Ãthãr al-jalìya)- abundant information about whole of the period. And he didn't limited his work in the events of his Iyalet or Iraqi Iyalets only, just like most of the Iraqi historiographers in this period. Therefore the Ûmari leave for us very important knowledge, which very useful for writing the history of Ottoman Iyalets in middle east in many aspects, Especially in the end of 18th and the beginning of 19th centuries.

The Yãsìn al-Ûmaries authoresses contain many information about district of Mardin, because its near the Mosul, also it was under the administration influence of Baghdad Iyalet at this time. This authoresses include many historical events of the internal anarchy and disorders, which caused by the uprising of its population against the ruler of Mardin. Or because of the campaigns of neighboring Iyalets and tribal attacks. The authoresses also, offer many information about the administrative changes, which the wali of Baghdad do it in the post of Mardin ruler which called (voyvoda). Al-Ûmari writes down some information in his historical authoresses, about the economical conjunctures and Health calamities, which happened in this region during the Ottoman period. Especially the events of famine and the deadly pestilence. These facts with other information mentioned in these authoresses, contribute to understanding the historical aspects of Mardin region in this period, according to Mosul s historian.

# ئادگاره سیاسییەکانی کوردستان
# لە دانراوە مێژووییە عیراقییەکانی سەردەمی عوسمانیدا*

## پێشەکی:

مرۆڤ چ تاك بێت، یاخود کۆمەڵ، شتێك نییە بە تاکو تەنیا بێت. بەڵکو لە دەوروبەرێکی پان و بەریندا دەژی کە بەهەموو شێوەیەك لەگەڵیدا لەکارلێککردنی هاوبەشدایە. بۆیە پێویستە کۆمەڵگەکان ئاشنای هزر وشێوازەکانی بیرکردنەوە وبۆچوونەکانی یەکتر بن. هەروەها بۆ ئێمە گرنگە، بزانین کۆمەڵگەکەمان چ وێنەیەکی لە هزری کۆمەڵگەکانی تر پێکهێناوە. ئەوەش ئامانجی ئێمەیە لەم توێژینەوەیەدا. لێرەدا هەوڵدەدەین هەڵوەستە بکەین لەسەر ئادگار وسیما سیاسییەکانی کوردستان بەپێی دانراوە مێژووییە عێراقییەکان لە سەردەمی عوسمانیدا، ئەمەش وەك هەوڵێك بۆ زانینی ڕەنگدانەوەی کەسێتیی سیاسیی کورد لە کۆمەڵگەی عەرەبی عێراقی و عوسمانیدا.

لەپێناو بەئەنجامگەیاندنی ئەم توێژینەوەیە، گەڕاینەوە بۆ گرنگترین ئەو کتێب و دانراوە مێژووییانەی لە سەردەمی عوسمانییەکان لە عێراق تۆمارکراون، جا بە هەر زمانێك نووسرابن. لافی ئەوەش لێنادەین کە هەموو ئەو کتێب و دانراوانەمان بینیبێت. چونکە هەندێکیان باس و هەواڵیان لە بارەی کوردو کوردستانەوە لە خۆ نەگرتووە، دەستیشمان بە ژمارەیەکی دیکەشیان نەگەیشتووە، ئەمەش یان لەبەرئەوەی لەبنەڕەتدا دیارنەماون، یانیش تا ئێستا وەکو دەستنووسێکی دەگمەن ماونەتەوە. هەروەها خۆیشمان پاراست لەوەی پشت بەو کتێب ودانراوانە ببەستین کە بەپێنووسی کورد خۆیان تۆمارکراون، وەك کتێبی (عنوان المجد فی بیان احوال بغداد و البصرە و نجد) کە زانای گەورەی کورد (ئیبراهیم فەسیح حەیدەری) دایناوە. چونکە خزمەتی ئامانجی بنەڕەتی

* ئەم باسە لەبنەڕەتدا توێژینەوەیەکی ئەکادیمییە و بەزمانی عەرەبی لە (گۆڤاری زانکۆی کەرکوك) بڵاوکراوەتەوە.

ئەم توێژینەوەیە ناکات. لێرەشدا پێوست ناکات گرنگترین ئەو سەرچاوانەی پشتمان پێ بەستوون، بخەینە بەر باس وشرۆڤەکاری. چونکە لە دەروازەدا ئەم کارە دەکەین.

لە دوماهیدا، دەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە مەبەست لە زاراوەی (دانراوە مێژووییەکان) هەموو ئەو کتێب و تۆمارکراوانەیە کە بەپاڵنەری مێژوویی روون و ئاشکرا نووسراون. ئەوانیش یان لە شێوەی کتێبگەلی مێژوویی رووت و پەتی، یان کتێبی سەربردەو ژیاننامە، یان لە شێوەی سەرنج و تێبینیگەلێك دان کە گەشتیارێك لەکاتی گەشتەکەیدا تۆماری کردوون. بەڵکو دەکرێ تەنها بریتی بێت لە چەند پەڕەیەکی کەم کە رووداوێکی مێژوویيان تێدا تۆمارکرابێت. ئەوەی ئێمە لەم توێژینەوەیەدا پشتمان پێبەستووە، لە چوارچێوەی ئەو کتێب و دانراوانە دەرناچێ. بۆیە دەستەواژەی (دانراوە مێژووییەکان)مان هەڵبژارد لە بری (سەرچاوە مێژووییەکان) کە بە واتا گشتییەکەی هەموو ئەو کەرستە و شتانە لەخۆ دەگرێ کە لە بواری نووسینی مێژوودا سوودیان لێ وەردەگیرێ وەك: دیکیۆمێنت و کتێب و رۆژنامە و پاشماوە مادییەکان و ئامرازی تری لەم جۆرە.

## دەروازە:

زانستی مێژوو لەعێراقی سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانیدا (١٥٣٤-١٩١٧) بە شێوەیەکی گشتی سستبوونێکی رێژەیی بەخۆوە بینی.[١] ئەوەش بەهۆی داگیرکرانی ئەم وڵاتە لەلایەن بیانییەکان و ئەو بارە ناسەقامگیرەی کە لەزۆربەی قۆناغەکانی ئەم سەردەمەدا باڵی کێشابوو بەسەر عیراقدا. لەئەنجامی سیاسەتی فەرامۆشکردن و ستەمکاری و تەشەنەکردنی بزاڤەکانی یاخیبوون و ئەو هەڵمەتە سەرکوتکارییانەی دەسەڵاتدارانی عوسمانی پیادەیان دەکرد.[٢] سەرەڕای ئەمەش لەم سەردەمەدا چەند نووسەر وزانایەك بەدیارکەوتن کە لەچوارچێوەی بایەخدان بە زانستە باوەکانی ئەو

(١) سەبارەت بە مێژوونووسین لە عێراقی ئەو سەردەمەدا، بڕوانە: د.عماد عبدالسلام رؤوف، التأريخ والمؤرخون العراقيون في العهد العثماني، ط٢، دار الوراق للنشر، لندن ٢٠٠٩.

(٢) بۆ وەستان لەسەر مێژووی عێراق لەم سەردەمەدا، بڕوانە: ستيفن همسلي لونكريك، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ت: جعفر الخياط، ط٦، بغداد ١٩٨٥.

سەردەمە، لەدەرگای زانستی مێژوونووسینیشیان داوە. وەکو: شێخ عوسمان کوڕی سەنەدی وائیلی بەسری (١٧٦٦-١٨٢٧) کە لە بوارەکانی: حەدیس و عەقیدە و فیقە و ڕێزمان و سەرف و ڕەوانبێژی و کێش و سەروا و ئەدەب و سۆفیگەری و بیرکاری و ئنجا مێژوو و ژیاننامە، نووسیویە.[1] یاخود کەسانێك لەلایەن بەرپرسانەوە یان کەس و کاریانەوە ڕاسپێردراون تا سەربردەی ژیانیان و بویەرو ڕووداوەکانی سەردەمەکەیان بنووسنەوە، وەکو: شێخ عەبدولرەحمان سوەیدی (١٧٢١-١٧٨٦) کە بە هاندان و چاودێریی خەدیجە خانمی کچی سەفیە خانمی کچی حەسەن پاشای والی بەغدا (١٧٠٤-١٧٢٣)، لەبارەی سەردەمی ئەم والییەو ئەحمەد پاشای کوڕی (١٧٢٣-١٧٤٧) نووسیوە.[2] لەوسەردەمەدا، کەسانێکیش هەن کەهەموو هەوڵە زانستییەکانیان بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ تۆمارکردنی مێژوو تەرخانکردووە و وەکو مێژوونووس بە هەموو مانایەکی ئەم واژەیە بەدیارکەوتووە، لەوانە سلێمان فایق بەگ کە لەساڵی ١٨٦٩ کۆچی دوایی کردووە.[3]

ئەم دانراوە مێژووییە عێراقییانەی لە سەردەمی عوسمانیدا تۆمارکراون، کە لەم توێژینەوەیەدا پشتمان پێ بەستوون،[4] لە ڕووی جۆر و شێوازیانەوە، بەم شێوەیەی لای خوارەوە ریزبەند دەکرێن:

---

(١) عثمان بن سند الوائلي البصري، مطالع السعود بطيب اخبار الوالي داود/ تأريخ العراق من سنة ١١٨٨ الى سنة ١٢٤٢هـ ( ١٧٧٤-١٨٢٦م)، تحقيق د. عماد عبدالسلام رؤوف و سهيلة عبدالمجيد القيسى، دار الحكمة للطباعة و النشر، الموصل ١٩٩١، ص٢٤-٣٠.

(٢) عبدالرحمن بن عبدالله السويدى البغدادي، حديقة الزوراء في سيرة الوزراء، تحقيق: د.عماد عبدالسلام رؤوف، مطبعة المجمع العلمي، بغداد ٢٠٠٣، ص٢٢٢.

(٣) سليمان فائق بك، تأريخ المماليك ((الكوله مند)) في بغداد، ترجمة: محمد نجيب ارمنازى، مطبعة المعارف، بغداد ١٩٦١، ص ب.

(٤) بەشێوەیەکی تایبەت پشتمان بەو کتێب و دانراوانە بەستووە کە دانەرەکانیان باسی کورد و کوردستانیان کردووە، نەخاسمە لە ڕووی سیاسییەوە.

## أ- مێژووی ئاسایی:

زۆربەی ئەم مێژووانە شێوازی تۆماری ساڵانە (واتە:کرۆنۆلۆژیا) پەیڕەو دەکەن و ڕووداوەکان بەگوێرەی ساڵەکان تۆمار دەکەن، بەڵام لە رووی بابەتەکانیانەوە جیاوازن. چونکە هەندێکیان یان زۆربەیان بریتین لە مێژووی شارەکان یان هەندێ ئیالەت (ویلایەت)ی دیاریکراو، بەتایبەتی ئیالەتی بەغدا، کە بەهۆی گرنگییە مێژوویی و کارگێڕییەکەیەوە، لەم دانراوانە پشکی هەرەزۆری بەرکەوتووە، گرنگترین ئەو مێژووانەش ئەمانەن:

١- کتێبی (گلشن خلفا) لەنووسینی (نەزمی زادە مورتەزا ئەفەندی بەغدادی/ ١٧٢٣ مردووە). ئەم کتێبە لەبنەڕەتدا بەزمانی تورکی دانراوە بۆ ئەوەی مێژووی بەغدا لە دەستپێکی خیلافەتی عەباسییەوە لەخۆبگرێ، بۆیە ئەم ناونیشانەی بۆ دانراوە، کە واتای (گوڵزاری خەلیفەکان) دەبەخشێ. بەڵام دانەر لە کتێبەکەیدا بەگشتی باسی رووداوە گرنگەکانی مێژووی ناوچەکەشی کردووە تاوەکو ساڵی ١٧١٧. ئەو زانیارییانەی کەتایبەتن بەڕووداوەکانی دوای ساڵی ١٦٢٨، لەکتێبەکەدا بایەخێکی بەرچاویان هەیە، لەبەرئەوەی نووسەر هاوچەرخی ئەو ماوەیە بووە. بەڵام لە گێڕانەوەی رووداوەکاندا گوزارشت لە تێڕوانینی عوسمانییەکان دەکات، چونکە خۆی یەکێك بوو لەو تورکە عوسمانییانەی نیشتەجێی بەغدا بوون.[1]

٢- کتێبی (دوحه الورزاو فی تأریخ وقائع بغداد الزوراو) لە دانانی شێخ رەسول حاوی کەرکوکلی (ساڵی ١٨٢٦مردووە). ئەم کتێبە بە تەواوکەری کتێبی (گلشن خلفا) دادەنرێ، چونکە تایبەتە بە مێژووی ئیالەتی بەغدا و ناوچەکانی سەر بەم ئیالەتە لە ماوەی ساڵانی (١٧١٩-١٨٢١) دا. کتێبەکە لەبنەڕەتدا بەزمانی تورکی عوسمانی و بە فەرمانی داود پاشای والی بەغدا (١٨١٦-١٨٣١) دانراوە. لەبەرئەوە دانەرەکەی گوزارشت لەبۆچوونی فەرمی ئیالەتی بەغدا دەکات و دەبینین بەشێوەیەکی ئاشکرا لایەنی دەوڵەتی عوسمانی گرتووە. وێڕای ئەوەش کتێبەکە بە سەرچاوەیەکی گرنگ دادەنرێ بۆ مێژووی ئەو سەردەمە. چونکە کەرکوکلی هاوچەرخی زۆربەی ئەو رووداوانە

---

(١) نظمي زاده مرتضى افندي، گلشن خلفا، ت: موسى كاظم نورس، مطبعة الاداب، النجف ١٩٧١، ص٥-٩.

بووە کە باسیان دەکات و بە حوکمی کارەکەیشی لە سەرای بەغدا، چاوی بە بەڵگەنامەو دیکیۆمێنتە فەرمییەکان کەوتووە.[1]

٣- (غایە المرام فی تأریخ محاسن بغداد دار السلام) ی مێژوونووسی موسڵی یاسین کوڕی خەیروڵڵا خەتیبی عومەری (١٧٤٤-١٨١٦). ئەم کتێبە وەك لە ناونیشانەکەی تێدەگەین بە تایبەت بۆ مێژووی بەغدا تەرخانکراوە. بەڵام هەر بەتەنها بە بەغدا و ناوچەکانی سەر بەم ئیالەتە نەوەستاوەو پەلیهاویشتووە بۆ باسکردنی زۆربەی ناوچە و شارەکانی عێراق. ئیتر لایەنی جوگرافییان وبەروبوومەکانیان و زانایان و ئەدیبان و ناودارانیشیان دەخاتەڕوو سەرباری خستنەڕووی ڕووداوەکانیان لەسەرەتای گرتنی بەغدا لەلایەن عوسمانییەکانەوە لە ساڵی ١٥٣٤ی زایینی تاوەکو ساڵی ١٢٢٠ك/ ١٨٠٥ز.[2] بەڵام ئەم مێژوونووسە ئەم ڕەخنەیەی لەسەرە کە لەهەموو دانراوەکانی بە ستایش و پێداهەڵدان خۆی لە بنەماڵەی جەلیلییەکان نزیك کردۆتەوە کە لەموسڵ حوکمڕان بوون، چونکە لە سێبەری ئەواندا دەژیا و بە بەخشش و چاودێرییان شاد بوو. ئەمەش وایلێکردووە کە زۆر جار لەڕاستی دووركەوێتەوەو هێرش بکاتە سەر ڕکابەرەکانیان، جا کەسایەتی بن یان گروپ، بەتایبەتی بادینییەکان و میرەکانیان.[3] بەڵکو کار گەیشتۆتە ئەوەی هەندێ جار هێرش بکاتە سەر کورد بەگشتی و بەخووڕەوشتی نەشیاو تاوانباریان بکات.[4]

---

(١) رسول حاوی الکرکوکلی، دوحة الوزراء في تأريخ وقائع بغداد الزوراء، ت: موسى كاظم نورس، مطبعة كرم، بيروت (د. ت)، ص٥-١١، هەروەها بڕوانە: عماد عبدالسلام، التأريخ و المؤرخون...، ص٤٣.

(٢) ياسين بن خيرالله الخطيب العمري، غاية المرام في تأريخ محاسن بغداد دار السلام، دار منشورات البصري، مطبعة دار البصري، بغداد ١٩٦٨، ص٤.

(٣) بۆ نموونە بڕوانە: م. ن، ص٩٧-٩٩.

(٤) بڕوانە: ياسين بن خيرالله الخطيب العمري، غرائب الأثر في حوادث ربع القرن الثالث عشر، مطبعة ام الربيعين، الموصل ١٩٤٠، ص٨١. بۆ وردەکاری زیاتر لەم بارەیەوە، بگەڕێوە بۆ: صديق الدملوجی، امارة بهدينان الكوردية او امارة العمادية، ط٢، مراجعة و تقديم: د. عبدالفتاح علي يحيى، اربيل ١٩٩٩، لاپەڕە ١٩-٢٧.

٤- (منيه الادباو فى تأريخ الموصل الحدباو) لەدانانی مێژوونووس یاسین عومەری. ئەم کتێبە لە دوای کتێبی (غایە المرام) داندراوەو لە مێژووی مووسڵ لە سەرەتای دامەزراندنییەو تا ساڵی ١٢٢١ك/١٨٠٦ز دەکۆڵێتەوە. بەڵام ئەو زانیارییانەی کە لەبارەی سێ سەدەی دوایین دەیانهێنێتەوە، لەڕووی وردەکاری و گرنگییان بەبایەخترن. سەرباری رووداوە سیاسییەکانیش، دانەر زانیاریگەلێکی گرنگ لەبارەی گوند و شارۆچکەکانی سەر بەموسڵ باس دەکات. هەروەها مێژووی کارەساتە سروشتییەکان وئەو نەهامەتی وشەڕ و ئاشوبانەی کە بەسەر ناوچەکە بەگشتی و مووسڵ بەتایبەتی هاتوون، تۆمار کردووە. بێگومان ئەوانەش زانیاریی زۆر بەسوودن، چونکە خودی مێژوونووس شایەتحاڵی زۆر لەو رووداوانە بووە.[١]

٥- (تأريخ بغداد/ أو: مرئه الزوراو فى أخبار الوزراو) لە دانانی مێژوونووس: سلێمان فایق بەگ (ساڵی ١٨٩٦ مردووە). ئەم کتێبە کە بەپاشکۆی کتێبی (دوحە الوزراو)ی کەرکوکلی دادەنرێ، زانیاری هەمە جۆری تێدایە لە بارەی ئیالەتی بەغدا و ئەو ناوچانەی لە رووی کاگێڕییەوە سەر بەم ئیالەتە بوون بە ناوچەکانی کوردستانی باشووریشەوە، تا ساڵی ١٨٦٠ کە ساڵی دانانی کتێبەکەیە. سەرنج و بۆچوونەکانی دانەری ئەم کتێبە بەوە جیادەکرێنەوە کە بابەتیانەن، ئەو رووداو وهەواڵانەش کەدەیانگێڕێتەوە تا رادەیەکی زۆر وردن، چونکە پشتی بەستووە بە تۆمارە فەرمییەکان و گێڕانەوەکانی ئەو کەسانەی هاوچەرخی ڕووداوەکان بوون. بێگومان لەپاڵ بینینەکانی خۆی، چونکە خۆشی یەکێك بوو لە مەمالیکەکانی بەغدا و لە سەردەمی حوکمڕانی ئەوان لەئیالەتی بەغدادا هەندێ پلەو پایەی گرنگی هەبووە.[٢]

---

(١) یاسین بن خیرالله الخطیب العمري، منیة الادباء في تأریخ الموصل الحدباء، تحقیق و نشر: سعید الدیوەجی، مطبعة الهدف، الموصل ١٩٥٥، ص٤-٦.

(٢) سلیمان فائق بك، تأریخ بغداد، ت: موسی کاظم نورس، مطبعة المعارف، بغداد ١٩٦٢، ص٣-٧، شایەنی گوتنە مێژوونووس (عماد عبدالسلام رؤوف) دەڵێت مێژوونووسی ناوبراو "لە شێوازەکانی نووسینی مێژوودا پسپۆڕە". بۆ زانیاری پتر لە بارەی ژیاننامە و نووسراوە مێژووییەکانی بگەڕێوە بۆ: التأریخ و المؤرخون العراقیون...، ص ٣١٥-٣١٩.

٦- (تأريخ حوادپ بغداد و البصره)ی شێخ عەبدولڕەحمان کوڕی عەبدوڵڵای سوەیدی بەغدادی. ئەم کتێبە مێژووی هەردوو ئیالەتەکە لەماوەی ساڵانی ١٧٧٢-١٧٧٨ ز دەگرێتەخۆ، ئەمەش ماوەیەکی گرنگە لەمێژووی عێراق و پڕ بوو لەگۆڕانکاری. بەڵام بەگوتەی ساغکەرەوەی کتێبەکە (د.عیماد عەبدولسەلام رەئووف) ئەم دانراوە زیاتر لەو کتێبە "یاداشتنامە کەسییانە دەچێ کە خاوەنەکانیان مێژووی رووداوەکانی سەردەمەکەیان تۆمار دەکەن، لەمیانەی تۆمارکردنی مێژووی ماوەیەکی دیاریکراو لە ماوەکانی ژیانیان". بۆیە عەبدولڕەحمان سوەیدی بە شایەتحاڵی زۆربەی ئەو رووداوانە دادەنرێ کە دەیانگێڕێتەوە. ئەوەی گرنگی کتێبەکەشی زیادکردووە ئەوەیە کەنووسەرەکەی گوزارشتی لە بۆچوونی سەرۆکایەتی ناوچەیی بەغدا کردووە وبۆچوونی فەرمی عوسمانی نانوێنێ.[1]

لەنێو ئەو کتێبە مێژووییانەی لەم سەردەمە دانراون، چەند کتێبێك هەن کەلەسەر بنەمای بابەت نووسراون. ئەم شێوازە تاڕادەیەك تایبەتە بە مێژوونووس سلێمان فایەق بەگ کە لەم بوارەدا چەند کتێبێکی داناوە، بەڵام ئەوەی لەم توێژینەوەدا بەلامانەوە گرنگە بریتین لە دوو کتێب:

١- تأریخ الممالیك الکولەمند فی بغداد، ئەمە نامیلکەیەکی بچووکە بەزمانی تورکی داندراوەو مێژووی سەردەمی دەسەلاتی مەمالیك لە ئیالەتی بەغدا (١٧٤٩-١٨٣١) تۆمار دەکات. بەڵام هەواڵ و رووداوەکانی ساڵەکانی دوایی وردەکارییەکی زیاتریان پێوە دیارە، بەتیبەتی سەردەمی والی داود پاشا (١٨١٦-١٨٣١) چونکە دانەر خۆی هاوچەرخی رووداوەکانی ئەو سەردەمە بووە.[2]

٢- حروب الایرانیین فی العراق، ئەم کتێبە کەلەبنەڕەتدا لەشێوەی نامیلکەیەکی بەزمانی تورکی بوو، لە مێژووی سەردەمی هەردوو والی: حەسەن پاشاو ئەحمەد پاشای کوڕی دەکۆڵێتەوە، بەتایبەت لەشکرکێشییەکانی ئەم دوو والییە لە ئێران لە سەروبەندی

---

(١) عبدالرحمن بن عبدالله السويدي البغدادي، تأريخ حوادث بغداد و البصرة من ١١٨٦-١١٩٢هـ/ ١٧٧٢-١٧٧٨ م، تحقيق د.عماد عبدالسلام رؤوف، دار الحرية للطباعة، بغداد ١٩٧٨ مقدمة المحقق، ص٧ ومابعدها.

(٢) بڕوانە: سليمان فائق بك، تأريخ المماليك ((الكوله مند)) في بغداد، ت: محمد نجيب ارمنازى، مطبعة المعارف، بغداد ١٩٦١.

داگیرکاریی ئەفغانی لەو ولاَتە لە دەیەی سێیەمی سەدەی هەژدەمین. کتێبەکە بە سەرچاوەیەکی گرنگ دادەنرێ بۆ رووداوەکانی ئەو لەشکرکێشییانە، چونکە وردەکاریی باش وزانیاریگەلێکی تەواو لەخۆدەگرێ لەسەر بابەتەکە. ئێمە بەهۆی (عەبدولجەبار ئەلعومەر)ەوە بەم کتێبە گەیشین کە وتارێکی لە گۆڤاری (ئافاق عربیە) بلاوکردەوە لەگەلٚ دەقی وەرگێڕانە عەرەبییەکەی کتێبەکە کە لە لایەن (محەممەد خەلوسی ئەلناسری)یەوە ئەنجامدراوە.[1]

ژمارەیەك دانراوی مێژوویی تر هەن کە دەکرێ بە مێژووی گشتی ناوببرێن، چونکە بەپێی توانایان هەموو رووداوەکانی ناوچەکە دەگرنەخۆ. لێرەدا بەتایبەت ناوی دوو کتێبی مێژوونووس یاسین عومەری دەهێنمەوە، یەکەمیان بەناوی (الآپار الجلیە فی الحوادپ الآرچیە) و دووهەمیشیان بەناوی (غرائب الآپر فی حوادپ ربع القرن الپالپ عشر). لە کتێبی یەکەمدا (عومەری) لە هەوەلٚین سالٚی کۆچییەوە وەریگرتووە تا سالٚی دانانی کتێبەکە (١٧٩٤ز)، تیادا باس لە مێژووی ناوچەکە لەنێویشیدا عێراق و ولاَتانی دراوسێ دەکات، بەتایبەت دەولەتی عوسمانی و ئێران. زانیاری وهەوالەکانیشی تەنها لایەنی سیاسی وهەلمەتە سەربازییەکان ناگرنەوە، بەلکو ئەو زۆربەی کارەساتە سروشتی و قەیرانە ئابوورییەکانی وەك: پەتاکان و زەمین لەرزەو قاتوقڕی وگرانیشی تۆمارکردووە، ئەمەش لە گرنگی کتێبەکەی زیادکردووە، نەخاسمە کە مێژوونووس شایەتحالٚی هەندێك لەو رووداوانە بووە.[2] کتێبی (غرائب الآپر)یش هەر لەسەر شێوەی کتێبەکەی پێشوویەتی ولەرووی گرنگییەوە لەویان کەمتر نییە. دیارە هەر ویستوویەتی زانیارییەکانی کتێبی پێشووی بەمەی دوایی تەواو بکات. چونکە لەرووداوەکانی سالاَنی ١٢٠٠-١٢٢٥ك دەکۆلێتەوە، بەلاَم سەرەتا چەند زانیارییەکی کورتی سەبارەت بە رووداوە سروشتییەکانی سالاَنی دوای ٢٤٠ك (٨٥٤-٨٥٥ز)، وەکو دەروازە نووسیوە.[3]

---

(١) سليمان فائق بك، حروب الايرانيين في العراق، تعريب: محمد خلوصى بن محمد سعيد الناصري التكريتى. لەلایەن (عەبدولجەبار ئەلعومەر) لە گۆڤاری (آفاق عربية) ژمارە (٣-٤) سالٚی ١٩٨٠ بلاوکراوەتەوە.

(٢) ياسين بن خيرالله الخطيب العمري، زبدة الآثار الجلية في الحوادث الأرضية، انتخب زبدته: د. داود الجلبي، تحقيق: عماد عبدالسلام رؤوف، مطبعة الآداب، النجف ١٩٧٤، ص٧-١٠.

(٣) بڕوانە: ياسين العمري، غرائب الأثر في حوادث ربع القرن الثالث عشر.

**ب- سەربوردە و ژیاننامە:**

ئەم دانراوانە، یـان ژیاننامـەی فـەرمانڕەوایان و ڕووداوەکـانی سـەردەمانیان لـەخۆ دەگرن، یان بـریتین لەسـەربوردە وژیاننامـەی زانایـان و ئـەدیبان و شـاعیران. لـەجۆری یەکەمیان، ئێمە پشتمان بە دوو دانراو بەستووە کە ئەوانیش ئەمانەن:

١- (حدیقه الزوراو فی سیره الوزراو) دانـانی شـێخ عەبـدولڕەحمان کـوڕی عەبـدوڵڵای سوەیدی، کە لەسەرەتای ئەم بابەتە ناومان هێنا و ڕوونمان کـردەوە کەمێـژووی سـەردەمی حەسەن پاشا و ئەحمەد پاشای کوڕی لـە ئیالـەتی بەغـدا تۆمـارکردووە. ئـەم کتێبـە بـە سەرچاوەیەکی گرنگ دەژمێردرێ بۆ مێژووی عێراق لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەمدا. چونکە ئیالەتی بەغدا لەو سەردەمەوە دەستیکردووە بـەپیادەکردنی هـەژمون ودەسـەڵاتی بەسەر زۆربەی ناوچەکانی عێراقـی ئێسـتا و هەنـدێ ناوچـەی ئێـران. سـوەیدی چـەندین ڕووداوی بەزمانی شایەتحاڵ تۆمارکردووە، بەتایبەتی ئەو ڕووداوانـەی کـە دەگەڕێنـەوە بـۆ سەردەمی ئەحمەد پاشا، چونکە هاوچەرخی ئەم سەردەمە بوو. بەڵام تێبینـی دەکـرێ کـە لایەنی هەردووکیانی گرتووە و ستایشی کردوون، ئەمەش مەسەلەیەکی سروشتییە، چونکە ئامانج لە دانانی کتێبەکە بەدیارخستنی شکۆمەندیی ئەوان بووە.[1]

٢- (مگالع السعود بگیب أخبار الوالی داود) لە دانانی شێخ عوسمان کـوڕی سـەنەدی وائیلی بەسری، کە لە دەستپێکی ئەم بابەتە ئاماژەمان پێدا. ئەگەرچی ئـەم مێژوونووسـە بەڵێنی بە داود پاشای والی دابوو کتێبێك دابنێ کە" وەسفە سوننییەکانی لـەخۆ بگـرێ" وەکو خـۆی دەڵێـت، بـەڵام کتێبەکـە لەناوەڕۆکـدا "سـەربوردەی خـودی میللـەت بـوو، بەکۆچـەری وشارسـتانییەوە، ورۆشـنبیر وخـەڵکی ڕەشـۆکییەوە" بـە پێـی دەربـڕینی ساغکەرەوەی کتێبەکە. بۆیە پڕیەتی لەچەندین کەرەستەی خاوی گرنگ لـەبارەی مێـژووی عێراق و ژمارەیەك وڵاتی دراوسـێ، لەسـەردەمێکدا کەچـەندان ڕووداوی بـەخۆوە بینیـوە ئەویش ماوەی نێوان ساڵانی (١٧٤٤-١٨٢٦)ـە. نەخاسمە کە دانـەر هاوچـەرخی زۆربـەی ئەم ڕووداوانە بووەو چاویشی بەو سەرچاوە بنەڕەتییانە کەوتووە کە خودی داود پاشـا بـۆی فەراهەم کردوون.[2] بەڵام ئەوەی بۆتە مایەی ڕەخنەگرتن لێی، ئەوەیە کەزێدەڕۆیی کـردووە

---

(١) بڕوانە: عبدالرحمن السویدی، حدیقة الزوراء، ص٦-٧، ١٤-١٥ (مقدمة المحقق).

(٢) عثمان بن سند الوائلي، م. س، مقدمة المحقق ص٧ ومابعدها.

لەوابەستەبوونی بەدەستەواژەی سەروادار و ڕستەگەلی ڕازاوەی قەبە و هەروەها لایەنـداریی دەسەلاتی فەرمی عوسمانی، بەتایبەتی دەسەلاتی ئیالەتی بەغدا لە سەردەمی داود پاشـا. ئەمەش بەپێی ئامانجی دانانی کتێبەکە مەسەلەیەکی بەلگەنەویستە.

سەبارەت بەکتێبەکانی ژیاننامەش، پێویستە ئامـاژە بـەکتێبی (منهـل الاولیـاو و مشرب الاصفیاو من سادات الموصل الحدباو) بدەین کە لەدانانی محەمـەد ئـەمین کـوڕی خـەیرولڵا خـەتیبی عومـەری (١٧٣٨-١٧٨٨) یـە. چـونکە دانـەر ئـەم کتێبـەی بـۆ نووسینەوەی ژیاننامەی ژمارەیـەك کەسـایەتی خـاوەن دەسـەلات و زانسـت و ئـەدەبی خەلکی موسلْ تەرخانکردووە. لێ باسیشی لەمەزاری ئـەولیا و پیاوچـاکانیش کـردووە. هەنـدێ زانیـاریی جوگرافیشـی لەسـەر مووسـلْ و ناوچـەکانی دەوروبـەری پێشـکەش کردووین. هەروەها مێژووی موسلیشی لەدوای سالی ١٠٠٠ك/١٥٩١ ز تـاوەکو سـالی ١٢٠١ك/١٧٨١ز وەرگرتـووە، ئـەم مێـژووەی دواییشـیان سـالی دانـانی کتێبەکەیـە. لەبەرئەمە کتێبەکە بۆتە سەرچـاوەیەکی مێـژوویی ڕەسـەن، نەخاسـمە کەمێژوونووسـی ناوبراو هاوچەرخی هەندێك لە ڕووداوەکانی بووە و بۆ گێڕانەوەی هەندێ ڕووداوی تـریش سوودی لەو کەسانە وەرگرتووە کە لە کاتی ئەو ڕووداوانـەدا ژیـاون.[1] هەنـدێ کتێبـی سەربوردە و ژیاننامەی دیکەش هەن، کـە بـەخێرایی ئاماژەیـان پێـدەدەین بـۆ ئـەوەی خۆمان لەدرێژکرنەوەی بابەتەکە بەدوور بگـرین. لەوانـە هەنـدێکیان بـاس لـەزانایان و ئەدیبان و شاعیران و چەند نموونەیەك لە کار و بەرهەمەکانیان دەکەن، بەتایبەت کتێبـی (الروچ النچر فی ترجمە ادباو العصر) لە دانانی عیسامەددین عوسمان کوڕی عەلی کـوڕی مورادی عومەری، وکتێبی: (شمامە العنبر و الزهر المعنبر) لە نووسـینی محەمـەد کـوڕی موستەفا غولامی. شیاوی گوتنە ئەم دوو دانەرەی دوایی، خەلکی موسلن و لە سـەدەی هەژدەمدا ژیاون.[2]

---

(١) محمدامین بن خیرالله الخطیب العمري: منهل الاولیاء و مشرب الاصفیاء من سادات الموصل الحدباء، ج١، تحقیق: سعید الدیوه جی، مطبعة الجمهوریة، الموصل ١٩٦٧، ص٥-٩.

(٢) بڕوانە: عصام الدین عثمان بن علي بن مراد العمري: الروض النضر في ترجمة ادباء العصر، تحقیق: د.سلیم النعیمی، ج١، مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد ١٩٧٤. محمد بن مصطفی الغلامي: شمامة العنبر و الزهر المعنبر، تحقیق: د.سلیم النعیمی، مطبعة المجمع العلمي العراقي بغداد ١٩٧٧.

### ج- سەرەڕای ئەوانەی ئاماژەمان پێدان:

هەندێ نووسراوی مێژوویی تر هەن کە ناوی (دانراوی مێژوویی) بە واتـای تـەواوی زاراوەکە بەسەریاندا ناچەسپێ، چونکە تەنها بریتین لە چەند لاپەڕەیەك کەبە شـێوەیەکی سـەرپێی تۆمـارکراون، یـاخود بـریتین لـە سـەرنج و تێبینیگـەلێك، کەسـانێك لـەنێو دەستنووسێکدا نووسیویانن کەمەرج نیە مێژوونووس بن. بەڵام ئەمانەش لە چوارچێوەی تۆمارکراوە مێژووییەکاندا دادەنرێن، یان باشـتر بڵـێین وەکـو یاداشـتنامەی کەسـایەتی دەژمێردرێن، چونکە باسی ڕووداوێکی مێـژوویی لـەخۆدەگرن کـە بـەزۆری کەسـانێکی شایەتحاڵی ئەو ڕووداوە تۆماریان کردووە. هەندێ جار هەر ئەم پەڕانە بە تەنیا وردەکاری گرنگ لەبارەی ڕووداوگەلێك باس دەکەن کە لەکتێبە مێژووییەکان هاوشێوەیان نـابینین. زەقترین نموونە بۆ ئەمەی دەیڵێین ئەو لاپەڕانەیە کـە هەنـدێ پیـاوانی ئـایینی نەسـرانی نووسویانە بۆ تۆمارکردنی سەرنج و بینینەکانی خۆیان لەکاتی لەشکرکێشییەکانی نـادر شا بۆ سەر عێراق و کوردستان لە چارەگی دووەمی سەدەی هەژدەمدا.[1]

### یەکەم: قەوارە سیاسییە کوردییەکان و میرانی کورد:

زۆربەی ناوچەکانی کوردستان سەربەخۆیی ناوخۆیی خۆیان بەدەستەوە بـوو و قـەوارە ناوچەییـەکانیان پاراست کاتێك چوونە پاڵ دەوڵەتی عـوسمانی لـە دوای شـەڕی چـاڵدێران (١٥١٤) وپێشهاتەکانی دواتر.[2] ئەوەبوو عـوسمانییەکان دانیان بـە میرنشـین و قـەوارە سیاسییە کوردییەکان نا و ڕژێمی کارگێڕی خۆیان لە ناوچەکە بەشێوەیەك پیادەکرد کـە

---

(١) بڕوانە: نرسیس صائغیان، صفحة منسیة من تأریخ نادر شاه، مجلة (لغة العرب)، ج٥، س(٧) بغداد ١٩٢٩. بطرس حداد، حملة نارد شاه علي العراق سنة ١١٤٥هـ في وثیقة سریانیة، مجلة (بین النهرین) ع٣٣، سنة ١٩٨١. سهیل قاشا: حملات نادر شاه علي العراق في وثائق سریانیة، ٢ج، مجلة (کاروان)، ع (٧٤-٧٥) نیسان و ایار ١٩٨٩.

(2) Crasy, Edward S.: History of the Ottoman Turks, London 1878, new Published (Khayats, Beirut 1961), p447.

بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ: د. سعدی عثمان هروتی، کوردستان و الامبراطوریة العثمانیة، دراسة في تطور سیاسة الهیمنة العثمانیة في کوردستان، مؤسسة موکریانی للنشر- اربیل، مطبعة خانی، دهوك، ٢٠٠٨، ص٣٩ ومابعدها.

لەگەڵ ئەم دانپێدانانە بگونجێت. لەئەنجامدا ئەم میرنشینانە وەکو (سنجەق) یان (لیوا) ئەژمارکران لە چوارچێوەی ویلایەتە عوسمانییەکاندا، بەڵام حوکمە بۆماوییە خۆماڵییەکانی خۆیان پاراست. تەنانەت قەوارە گرنگەکان یاخود گەورەکانیان بە فەرمی بە "حکوومەت-Hukumet" ناودەبران. میرەکانیشیان بە "سەربەست میرمیران-Serbest Miri Miranlik" واتە: بە گلەربەگە سەربەستەکان، ناسرابوون. لەنووسراوە فەرمییەکانیشدا بە نازناوی "جەناب-Cenab" بانگ دەکران.[1] شایەنی گوتنە میرە کوردەکان لە سەرەتادا زیاتر نازناوی "بەك" یان "بێك"یان هەڵگرتبوو.[2] ئەمەش زاراوەیەکی تورکییە، واتە: رابەر یان سەرۆك، لەڕاستیشدا وەکو سەرۆکەکانی لیواکان "سنجەق بەك" دادەنران و پایەی "(میرلیوا" یان هەبوو،[3] بەڵام تێبینی ئەوە دەکەین کە لەسەدەی هەژدەمینەوە پایەی (میری میران)یش وەردەگرن، ئیدی لەوکاتەوە نازناوی "پاشا"یان دەبێ.[4]

ئەم جیاوك وئیمتیازاتە سیاسی-کارگێڕییە کوردییانە، لەسەرچاوە مێژووییە عێراقییەکاندا بە ڕوونی بەرچاو دەکەون، ئەویش لەمیانەی ئەو ئاماژە زۆرانەی کە بۆ میرنشینە کوردییەکان دەکرێن، ئەمەش بەڵگەی بەردەوامی ومانەوەی ئەم قەوارە

---

(1) Ayni Ali Efendi (Defteri Hakani Emini-1018/1909): Osmanli Imparatorlugunda Eyalet Taksimati, Toprak Dagitmi ve Bunlarin Mali Gucleri, Bu gunkudile Ceviren: Hadiye Tuncer, Gursoy Basmevi-Ankara 1964, S. 13. Uzuncarsili, Ismail Hakki: Buyuk Osmanli Tarihi, cilt 2, Ankara-1995, S.580.

بۆ وردەکاریی لەو بارەیەوە، بڕوانە: د.سعدی عثمان حسین، کوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر و الثامن عشر، دراسة في علاقاتها السياسية و الادارية و الاقتصادية مع ايالتى بغداد و الموصل، اربيل ٢٠٠٦، ص٧٨-٨٥.

(٢) بۆ نموونە بڕوانە: شرفخان البدليسی، شرفنامه، ت: محمد جميل الملا احمد الروزبيانى، ط٢، مؤسسة موكريانى، اربيل ٢٠٠١، صفحات: ٢٤٨، ٢٤٩، ٣٥٣، ٤٣٧. د.عماد عبدالسلام رؤوف، دراسات وثائقية في تاريخ الكورد الحديث و حضارتهم، منشورات وزارة الثقافة، اربيل ٢٠٠٨، صفحات: ١٥٧، ١٨١، ٢١٤.

(٣) بڕوانە: سعدی عثمان، کوردستان الجنوبية، ص٨٤.

(٤) بۆ نموونە بڕوانە: اسماعيل عاصم كوچك چلبى زاده: تأريخ چلبى زاده، مطبعة عامره، استانبول ١٢٨٢هـ، ص٨٦. احمد جودت، تاريخ جودت، از ترتيب جديد، ج١، مطبعة عثمانية، استانبول ١٣٠١، ص٢٧٣، ٢٧٤.

کوردییانە لەسەدەکانی دواتر بەدەستەوە دەدەن. لەهەندێ لەو سەرچاوانەدا زۆرجار دەستەواژەکانی "میرنشینیی بابان" و "حکومەتی بابان" دەبینین.[1] بەڵکو مێژوونووسی موسڵی یاسین عومەری وا ئاماژە بە میرنشینی بۆتان دەکا کە "مەملەکەتێکی سەربەخۆ" بێت. بەلاّم بێگومان مەبەستی ئەوەبووە کە لەڕووی کارگێڕی نێوخۆییەوە سەربەخۆ بووە، چونکە دواتر ئاماژە دەدات کە ئەم میرنشینە لەسەرەتادا سەر بە ئەیالەتی دیاربەکر بوو، بەلاّم پاشان لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەمدا خرایە سەر ئەیالەتی بەغدا.[2] لەسەروبەندی لەشکرکێشییەکانی عوسمانیش بۆ سەر میرنشینی ئەردەلاّن لە ناوەڕاستی سەدەی شازدەهەمدا، دانەری کتێبی (گلشن خلفا) ئاماژە بە بەشداریکردنی "میرە کوردە حکومییەکان" دەکات.[3] ئەم دەستەواژەی دوایی شایەنی شرۆڤەکارییە. چونکە دەکرێ دەستەواژەکە لە دانە ئەسڵییەکەی کتێبەکە کە بەزمانی تورکییە، بەواتای "میرانی حکومەتە کوردییەکان" هاتبێ، بەلاّم وەرگێڕ بە هەڵە وەریگێڕابێت. ئەگەر وەرگێڕانەکەش ڕاست بێت، ئەوا دەستەواژەکە ئاماژە بەوە دەکات کە ئەم میرە کوردانە سەر بەحکوومەت یاخود دەوڵەتی عوسمانی بوونە وبەفەرمی دان بە دەسەلاّتە خۆماڵییەکانیان نراوە، کەواتە لە هەردوو باردا دەستەواژەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کوردان پارێزگارییان لە قەوارە خۆماڵییەکانی خۆیان کردووە.

بڕێ جار، ناوی میرنشین وقەوارە کوردییەکان بەشێوازێك دێت کەسیفەتە کارگێڕییەکە بەدیار دەخات، بێ ئەوەی جەخت بکاتە سەر سیفەتی سیاسی ئەو میرنشین و قەوارانە، کە لەڕاستیدا ئەمە سیفەتی بنەڕەتییە. ئەمەش مەسەلەیەکی ئاساییە، چونکە زۆربەی ئەو مێژوونووسانە- وەك لە دەستپێکی توێژینەوەکەدا گوتمان- گوزارشتیان لە بۆچوونی عوسمانی دەکرد و لە گۆشەنیگای ئیالەتی بەغداوە سەیری ئەم قەوارانەیان دەکرد، دیارە ئەم ئیالەتەش هەژمونی کارگێڕی بەسەر زۆربەی میرنشینەکانی

(١) عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص١٨٣، ١٥٤، ١٥٥.

(٢) غاية المرام، ص١١١.

(٣) نظمي زاده، م. س، ص٢٠٤.

باشووری کوردستان هەبوو.[1] ئەوەتا مێژوونووس عەبدولرەحمان سوەیدی کە ئاماژە بە میرنشینی بابان دەکات دەستەواژەی "سنجەقەکانی کوردانی بەبە" بەکاردەهێنێ.[2] سلێمان فایەق بەگیش، جارێ بە "لیوای بابان"[3] و هەندێ جاری تریش بە "موتەسەرفییەتی سلێمانی" ناوی بردووە.[4] هەرچی رەسوول کەرکوکلیشە، دەستەواژەی "موتەسەرفییەتی کۆیسەنجەق و هەریر" بەکاردێنێ لەکاتی باسکردنی ئەسپاردنی حوکمی ئەو دەڤەرانە بە یەکێك لە میرانی بابان لە بری میرێکی سۆران لەنیوەی دووەمی سەدەی هەژدەمدا. لە رووداوێکی دیکەدا مێژوونووسی ناوبراو دەڵێت: "ئنجا فەرمان دەرچوو بە دامەزراندنی... بۆ لیواکانی هەریر و هەولێر و کۆیری".[5] شایەنی باسە، ووشەی لیوا وەرگێڕانە عەرەبییەکەی ووشەی (سنجەق)ی تورکیە، کەیەکەیەکی کارگێڕی بچووکتر لە ویلایەت یان ئیالەت بوو.[6] لە دستپێکی بابەتەکەماندا گوتمان میرنشینە کوردییەکان لە ناو ویلایەتە عوسمانییەکاندا، وەکو سنجەق دەژمێردران. زاراوەی (موتەسەرفییەت)یش لە رووی کارگێڕییەوە واتایەکی هاوشێوەی هەردوو ووشەی پێشوو دەبەخشێت.

مێژوونووسانی عێراقی واژەی تریش بەکاردەهێنن بۆ ئاماژەدان بەمیرنشینە کوردییەکان، وەکو واژەی "مقاگعە/ دەڤەر"[7] کە ئەویش زاراوەیەکی جوگرافییە.

---

(١) لەبارەی هەژمونی کارگێڕیی ئیالەتی بەغدا لە سەردەمی عوسمانیدا، بڕوانە: سعدي عثمان، كوردستان الجنوبية...، ص١٠٨-١١٣.

(٢) حديقة الزوراء، ص١٣٦.

(٣) حروب الايرانيين...، ص١٠٢.

(٤) تأريخ بغداد، ص١٣٩.

(٥) دوحة الوزراء، ص١٧٦، ١٥١.

(٦) عوسمانییەکان لەماوەی نێوان ١٥٩١-١٨٦٤ بەفەرمی زاراوەی ئەیالەتیان لەجیاتی ویلایەت بەکاربردووە. بڕوانە: دائرة المعارف الاسلامية، (الترجمة العربية)، مجلد (٥)، مادة: ايالة (خليل اينالجق)، ص٢٦٤. لەبارەی رژێمی کارگێڕی عوسمانی، بگەڕێوە بۆ: مرادجه دوسون: نظم الحكم و الادارة في الدولة العثمانية. ت: فيصل شيخ الارض، رسالة قدمت من قبل المترجم الى دائرة التأريخ في جامعة بيروت الامريكية لنيل شهادة استاذ في العلوم/١٩٤٢.

(٧) رسول الكركوكلي، م. س، ص١٤٥، ١٤٦. سليمان فائق، تأريخ بغداد، ص١٤.

هەندێ جاریش لـەرووی هۆزایەتییـەوە سـەیری دەکـەن، بـە نموونـە (یاسـین عومـەری) دەستەواژەی "کوردانی هەکاری... کوردانی بەهدینان"[١] بەکاردەبات بۆ ئاماژەدان بـە هەردوو میرنشینی هەکاری و بادینـان. هەریـەك لـە عەبـدولڕەحمان سـوەیدی و رەسـول کەرکوکیش لـەوە زیـاتر پێهەڵـدەنێن، کاتێـك دەسـتەواژەکانی "خێڵـەکانی کـورد" و "عەشیرەتەکانی کورد" بەکاردێنن بۆ ئاماژەدان بەهێزەکانی میرنشینە کوردییـەکان لـە شەڕێکی دەوڵەتی عوسمـانی لـەدژی ئێـران.[٢] سـەرباری ئـەوە ئـەم مێژوونووسـانە بـۆ ئاماژەدان بەمیرنشینی بابان یان بابانییەکان، دەستەواژەی تر بەکاردێنن، وەك "کۆمەڵی بەبە"[٣] و "کوردانی بـەبا"[٤] یـان "بابـا" بەتـەنیا.[٥] ئەمانـەش دەسـتەواژەگەلێکن بـەکاردەبرێن بـۆ ئامـاژەدان بەکۆمـەڵێکی مرۆیـی کەدەچـنەوە سـەر ناوچـەیەك یـان میرنشینێکی دیاریکراو کە میرنشینی بابانە. سەبارەت بەم میرنشینەش تێبینی دەکـرێ کە لەکوردستانی باشوور دەسەڵاتێکی بەرچاوی هەبووە، نەخاسمە لەناوەڕاسـتی سـەدەی هەژدەمەوە. بەجۆرێك کە لەدیدگای ئیالەتی بەغـداوە گوزارشـتی لـەخودی کوردسـتان دەکرد، لەبەر ئەوە زاراوەی "کوردستان" یان دەستەواژەی "ناوچەی کوردنشـین" لـەلای هەندێ مێژوونووسانی عێراقی هاوتای ناوی "میرنشینی بابان" بـوو.[٦] شـایەنی باسـە ئەم حاڵەتە لای هەندێ گەڕیدەی بیانی و مێژوونووسانی عوسمانیش، هەر بەم شێوەیە.[٧]
شێوەیە.[٧]

هەرچی پەیوەستیشە بەسیفەت و وێنای سەرۆك ومیرانی کـورد لـەدانراوە مێژووییـە عێراقییەکاندا، ئەوا لێرشدا جیاوازییەکی بەرچـاو دەبیـنین. ئەمـەش بـەپێی جیـاوازی

---

(١) غاية المرام، ص٩٢.

(٢) حديقة الزوراء، ص٢٨٣. دوحة الوزراء، ص٢٢.

(٣) نظمي زاده، م. س، ص٢٩٦.

(٤) ياسين العمري، زبدة الأثار، ص١٣١. هەروا بڕوانە: عبدالرحمن السويدي، حديقة الزوراء، ص٦٣.

(٥) ياسين العمري، غاية المرام، ص١٨٥.

(٦) رسول الكركوكلي، م. س، ص١٣٧، ١٤٦. سليمان فائق، تاريخ بغداد، ص١٣٧.

(٧) كلوديوس جيمس ريج، رحلة ريج في العراق عام ١٨٢٠، ت: بهاءالدين نورى، مطبعة السكك الحديدية، بغداد ١٩٥١، ص٣١٥. احمد جودت، م. س، ج٤، ص٨٥.

مێژوونووسانی عێراقی و هەروا جیاوازی کەسایەتییەکانی ئەو میرانە وراددەی دەسەڵات و ئنجا هەڵوێستیان بەرامبەر بە دەسەڵاتی عوسمانی. ئەوەتا مێژوونووسە عێراقییەکان لە تۆمارکردنی نازناوی میرانی کورد زۆر جار راستییان پێکاوە، بەتایبەتی کە بەر لە ناوەکانیان واژەی "میر" یان بەکاربردووە.[1] بەڵکو هەندێ جار شێوازە کوردییەکەی ئەم واژەیان بەکارهێناوە. بۆ نموونە ناوی سلێمان بەبەی میری بابان (١٦٦٩-١٦٩٩) و میر حەسەنی برای لە کتێبی (گلشن خلفا)دا بە "میر سلێمان" و "میر حەسەن" هاتووە.[2] زۆر جاری دیکەش ناوەکانیان لەگەڵ سیفەتی (حاکم/ سەردار) هێنراوە، وەك ئەوەی کە نووسیویانە "حاکمی ئامێدی"[3] و "حاکمی بابان".[4] لەم بارەشدا زۆر لە ڕاستی لایان لایان نەداوە بەو پێیەی ئەوان حوکمی میرنشینەکانیان دەکرد، واتە سیفەتەکە لە کارەکەوە هاتووە. بەڵام مێژوونووسانی عێراقی بەزۆری جەخت لەسەر سیفەتی کارگێڕی ئەو میرانە دەکەن و سیفەتە سیاسییەکەیان پشتگوێ دەخەن. ئەمەش کاتێك بە دەستەواژەکانی "موتەسەڕیفی بابان"[5] و "موتەسەڕیفی سلێمانی"[6] یان "موتەسەڕیفی عیمادییە"[7] وەسفیان دەکەن. بەڵکو بە راشکاویش دەستەواژەی "پایەی "پایەی موتەسەڕیفییەت" بەکاردێنن، کاتێ ئاماژە بە حوکمڕانی ئەو میرانە دەکەن لەمیرنشینەکانیان.[8] هەندێ جاری تریش لەنووسینی نازناوی میرە کوردەکاندا وردنین و

---

(١) نظمي زاده، م. س، ص٢٠٥. عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص١٥٧. ياسين العمري: غاية المرام، ص٩٣.

(٢) نظمي زاده، م. س، ص٢٩٦.

(٣) رسول الكركوكلي، م. س، ص٢٢٤. ياسين العمري، زبدة الآثار، ص٧٨.

(٤) عثمان بن سند الوائلي، م . س، ص١٤٨.

(٥) رسول الكركوكلي، م. س، ص٩٣. عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص١٧٦.

(٦) سليمان فائق، تاريخ بغداد، ص٣٠.

(٧) عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص٢٧١.

(٨) بڕوانە: سليمان فائق، تاريخ بغداد، ص١٣٦.

دەستەواژەگەلێکی هەڵە بەکاردێنن، وەکو "سنجەقی بەبەی بەکر ناو".[1] یاخود ڕەمەکییانە، کاتێك بە والی وەسفیان دەکەن، کە ئەمەش سیفەت و نازناوی سەرداری ویلایەت یان ئیالەتە عوسمانییەکانە ونابێت بێجگە لەخۆیان کەسێکی تر بەم سیفەتەوە ناو بهێنرێ. بەڵام لەکتێبە مێژووییە عێراقییەکاندا، دەستەواژەگەلی "والییەکانی جزیرە و ئامێدی [مەبەست لەمە هەردوو میری بۆتان و بادینانە]"[2] و "والی عیمادییە"[3] و و "والی قەرەچوالان [مەبەست میری بابانە]"[4] دەبینین.

هەروەها، لەو دانراوە مێژووییە عێراقییانەدا سەرنج دەدەین کەزۆربەی میرە کوردەکان نازناوی "پاشا"یان هەڵگرتووە بەتایبەت لەسەدەی هەژدەمەوە، ئەم نازناوەش گوزارشت لەوە دەکات کە خاوەنەکەی-وەك لە دەستپێکی ئەم بابەتە روونمان کردەوە- پایەی (میری میران)ی هەیە. ئەم پایەیەش سەرەتا دەدرایە سەرداری ویلایەتەکان، واتە (بەگلەربەگی)یەکان، بەڵام دواتر درایە سەرداری سنجقەکانیش. بەڵام بەبێ ئەوەی ئەرکێکی کارگێڕیی بەرزتریان هەبێت.[5] ئیتر میرە کوردەکانیش بوونە خاوەنی ئەم پلە و و پایەیە. لەبەرئەوە دەبینین دانراوە نێوبراوەکان پڕن لە ناوی چەندین میری کورد کە پایەی پاشایان هەڵگرتووە. زۆربەشیان لەو میرانانەن کە لەمیرنشینەکانیان دەسەڵاتدار

---

(١) نظمي زادە، م. س، ص٣٢٨، دەستەواژە دروستەکە وەهایە: (حاکمی سنجەقی بەبە کە ناوی -بەکر -ـە)، ناوبراو میر بەکر بەگی بابانە کە لەماوەی ساڵانی (١٧٠٣-١٧١٤) حوکمڕانی میرنشینەکەی کردووە. لەبارەی ژیاننامەی بڕوانە: سعدي عثمان، امارة بابان في النصف الاول من القرن الثامن عشر، مؤسسة موکریاني، اربيل ٢٠٠٠، ص٢٤-٢٧.

(٢) نظمي زادە، م. س، ص٢٩٧.

(٣) عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص٢٧١.

(٤) ياسين العمري، غاية المرام، ص١٨٥.

(٥) سەبارەت بە پەرەسەندنی مێژوویی ئەم پایەیە، بگەڕێوە بۆ: هاملتون جيب و هارولد بوين، المجتمع الاسلامي والغرب، ت: عبدالمجيد حسيب القيسي، ج١، ق١، ط١. دار المدى للثقافة و النشر، دمشق ١٩٩٧، ص١٨٤-١٨٥.

بــوون. لەوانــە بــۆ نموونــە: "ســەلیم پاشــا"[1] و "عەبــدولرەحمان پاشــا"[2] و "بــەهرام پاشا"[3]، دوای نازناوی (پاشا)یش، جاروبار چەند نازناوێکی ترمان بەرچـاو دەکـەوێت، وەك: "پاشای بەباوی"[4] و "پاشای کوردی"[5]. لەم میرانە ژمارەیەکی کەمیشیان والی والی بوون لەسەر یەکێك لەئیالەتە عوسمانیەکان، بەتایبەتی ئیالەتی مووسڵ کە دانـانی ژمارەیەك والی کوردی بەخۆوە بینی، لەوانە: "داسنی میرزا پاشا" کـە لـەمیرە کـوردە ئێزیدییەکان بوو و لەساڵانی (١٦٤٩-١٦٥٠) حوکمڕانی موسڵی لەدەست بوو.[6] لەپاڵ لەپاڵ ئەم میرانە، هەندێ لەسەرۆك هۆزە کوردییەکانیش ئـەم جیاوکـەیان هـەبوو بۆیـە نازناوی (پاشا)یان هەڵگرتبوو. لەوانە بۆ نموونە (تەمەر) یان (تـەیمور پاشـا)ی سـەرۆکی هۆزی مللی.[7]ئەمەش بەپێی ئەوەی لە دانراوەکانی یاسین عومەریدا هـاتووە.[8] بـەڵام وادیارە ناوبراو کاتێ ئـەم نازنـاوەی وەرگرتـووە کـە لەسـاڵی ١٨٠٠ بـەحاکمی رەققـە

---

(١) رسول الكركوكلي، م. س، ص٩٣. سەلیم پاشا لەنێوان ساڵانی (١٧٤٣-١٧٤٧) و (١٧٤٩-١٧٥١) حوکمی میرنشینی بابانی کردووە. بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: سعدي عثمان: امارة بابان...، ص٣٩ ومابعدها.

(٢) سليمان فائق، تاريخ المماليك،ص٤١. عەبدولرەحمان پاشان لەنێوان ساڵانی ١٧٨٩-١٨١٣ شەش جار بەپچڕ پچڕی حوکمی بابانی کردووە. بڕوانە: محمد امين زكى: تاريخ السليمانيه وانحائها، ت: الملا جميل الروزبيانى، بغداد ١٩٥١، ص١٠٢-١٣٣.

(٣) ياسين العمري، زبدة الآثار، ص٩٤. بەهرام پاشا لە ماوەی ساڵانی ١٧١٤-١٧٦٨ میری بادینان بووە و ناوبانگی بە (بەهرام پاشای مەزن) دەرکردووە. بڕوانە: كاوه فريق احمد شاولى ئاميدى، امارة بادينان ١٧٠٠-١٨٤٢/ دراسة سياسية اجتماعية ثقافية، منشورات مؤسسة موكرياني، اربيل، مطبعة خبات-دهوك ٢٠٠٠، ص٥١-٦٣.

(٤) ياسين العمري، زبدة الآثار، ص١٢١.

(٥) عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص٢٧٠، ٢١١.

(٦) ياسين العمري، منية الادباء، ص٧٤.

(٧) لەو هۆزە کوردیانە بوو کەبە بەهێزی و نەبەردی و یاخیبوونیان لە دژی دەسەڵاتدارێتی عوسمانی ناسرابوو، لەدەوروبەری ماردین نیشتەجێ بوون. بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: د.احمد عثمان ابوبكر، اكراد الملي وابراهيم باشا، مطبعة دار الجاحظ، بغداد ١٩٧٣.

(٨) بڕوانە: غاية المرام، ص١٩١، زبدة االآثار، ص١٦٤. غرائب الاثر، ص٢٣.

داندراوە، ، چونکە سەرچاوەکانی تر بە: "تەیمور ئاغا"[1]یـان: "تـەیمور مللـی" ناویـان بردووە کاتێك تەنها سەرۆك هۆزێك بوو.[2]

هەندێ لەمیرانی کورد پێش ئەوەی حوکمڕانی میرنشینەکەیان بگرنە ئەستۆ، نازناوی پاشایان بەدەستهێناوە. بەڵام ئەم نازناوە زۆر جار پاداشتێك بوو لەهەمبـەر خزمـەتێکی گرنگ کە پێشکەشی دەوڵەتیان کردووە. وەك: عوسمان بەگی کوڕی مەحموود پاشای بابان کەنازناوی پاشای لەلایەن سـلێمان پاشـای مـەزنی والـی بەغـدا (١٧٨٠-١٨٠٢) پـێ بەخشراوە لە بەرامبەر رۆڵی کاریگـەری لـە دامرکاندنـەوەی یاخیبوونێـك کەمەترسـیی لەسەر ئیالەتی بەغدا دروستکردبوو.[3] لەم حالەتەی دوایی بەدیاردەکەوێ کەوالی بەغدا بەغدا دەسەڵاتـی هەبوو کە ئەم پلەیە بەمیرە کوردەکان ببەخشێ. جیا لەمەی باسـکرا، تاکە نێرینەکانی بنەماڵەی دەسەڵاتدار لەمیرنشینە کوردییەکاندا، واتە ئەو میرانەی کـە دەسەڵاتیان وەرنەگرتبوو، زۆرجار تـەنها نازنـاوی (بـەگ)یان هـەڵگرتبوو. [4] هـەروەها زۆربەی هەرەزۆری میرە کوردەکانیش لەسەدەی شازدەهەم و ماوەیەکی زۆریش لە سەدەی دواتر تەنها ئەم نازناوەیان هەبوو.[5]

ئەمە سەبارەت بەمیرانی کوردی سەر بەدەوڵەتی عوسمانی، بەڵام لە ئێرانـدا میرانـی کورد بەزۆری نازناوی (خان)[6] یان هەبوو.[7] ئەمەش لەدانراوە مێژووییە عێراقییەکاندا

(١) رسول الکرکوکلي، م. س، ص٢١٣.

(٢) عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص٢٠٣.

(٣) رسول الکرکوکلي، م. س، ص١٧٢.

(٤) بڕوانە: م. ن، ص١٧٦. سليمان فائق، تاريخ بغداد، ص١٣٦. ياسين العمری، زيدة الآثار، ص١٦٠.

(٥) بڕوانە: نظمی زادە، م. س، ص٢٠٥. ياسين العمري، زبدة الآثار، ص٦٧.

(٦) خان: نازناوێکە لەکۆندا بە شاهەکانی تورك و سوڵتانەکانی عوسمانی گوتراوە. هەروەها بەمیرانی قەرم وهەندێ لە میرانی ویلایەتە رۆژهەڵاتییەکان گوتراوە. د. سهيل صابان، المعجم الموسوعي للمصطلحات العثمانية التاريخية. مراجعة: د. عبدالرزاق محمد حسن برکات. مکتبة الملك فهد الوطنية، الرياض٢٠٠٠، ص٩٥. لە ئێرانیش بەهەندێ لە سەردارانی ناوچەکان وسەرکردەکانی دەوڵەت گوتراوە.

(٧) بۆ نموونە بڕوانە: اسکندر بيك ترکمان، تاريخ عالم ارای عباسي، چ٢، انتشارات امير کبيرتهران ١٣٥٠هـ. ١٣٥٠هـ. ش، ج٢، ص٧٩٣، ج٣، ص٩٢٥، ١٠١٩.

عێراقییەکاندا ڕەچاوکراوە، ئەوەتا کاتێك ناوی ئەو میرانە لەم دانراوانەدا دێت، دەبینین لەدوای ناوەکانیان نازناوی (خان) دانراوە. وەك: "ئەحمەد خان"[1] و "ئەمانوڵڵا خان"[2]. هەروەها میر ودەسەڵاتدارانی بنەماڵەی کوردی زەندیش کە لەئێران دەسەڵاتدار بوون (١٧٥٠-١٧٩٥) بەم نازناوە ناسرابوون، لەسەروشیانەوە "کەریم خانی زەند"[3] و"سادق خان"ی برای کە لەساڵی ١٧٧٦ بەسرەی داگیرکرد.[4] بەڵام تێبینی دەکەین کە هەندێ لەمیرانی کورد لەدەوڵەتی عوسمانیش بەنازناوی (خان) ناسرابوون، بەتایبەتی هەندێ لەمیرانی بادینان.[5] هەندێ جار واژەی (بەك)یش دەخرایە پاڵ نازناوی (خان).[6] ئەگەر ئەمە پەیوەست بێت بەنەریتەکانی ئەم میرنشینەوە، وەك ئەوەی هەندێ لە توێژەران وادەڵێن،[7] ئەوا مەسەلەکە لەهەموو میرنشینەکان وانەبوو.چونکە هەڵگرتنی ئەم نازناوە برێ جار گوزارشتی لە هەواداریی ئەو میرە بۆ ئێران دەکرد، وەکو سەلیم پاشای بابان کە لەهەندێ لە دانراوە مێژووییە عێراقییەکاندا بە "سەلیم خان" ناسرابوو.[8] ئەوەتا سلێمان فایق بەگ دەڵێت: "واژەی خان لە بری پاشا کە بەڕۆڵەکانیان

---

(١) نظمي زادە، م. س، ص٢٢١، ٢٢٥، میری ناوبراو (خان ئەحمەد خان)ـە کە یەکێك بوو لە میرە فرە بەهێز و تواناو ناسراوەکانی ئەردەڵان و ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوە لە ڕووداوەکانی ناوچەکە لە سەروبەندی هێرشەکانی شا عەباسی یەکەمی سەفەوی (١٥٨٧-١٦٢٩) بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی. بڕوانە: م. ن، ص٢٢١-٢٢٦، هەروەها: اسکندر بیك ترکمان، م. س، ج٣، ص١٠١٩.

(٢) سلیمان فائق، تاریخ بغداد، ص٣٠. ئەم میرە ناوبراوەش میری ئەردەڵانی بەناوبانگ ئەمانوڵڵا خانی یەکەمە (١٧٩٩-١٨٢٥).

(٣) سلیمان فائق، تاریخ الممالیك، ص٢٧. رسول الکرکوکلي، م. س، ص١٥٨. عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص٨١. لەبارەی سەردەمی کەریم خان و بنەماڵەی زەندی دەسەڵاتدار لەئێراندا، بڕوانە:
Perry, John R: Karim Hhan Zand/ A History of Iran 1747-1779, the univ. of Chicago press 1979.

(٤) رسول الکرکوکلي، م. س، ص١٥٠-١٥١. عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص٨٤، ٨٨.

(٥) بڕوانە: رسول الکرکوکلي، م. س، ص٢٢٤. نظمي زادە، م. س، ص٣٠٤، ٣٠٥.

(٦) وەکو: مراد خان بەك و حاجی خان بەك. بڕوانە: یاسین العمري، عزائب الاثر، ص٢٢، ٣٦.

(٧) کاوە فریق ئامیدی، م. س، ص٤٨.

(٨) بڕوانە: یاسین العمری، زبدة الآثار، ص١٠٧.

بەرۆڵەکانیان [رۆڵەکانی بنەماڵەی بابان] دەگوترا، لەپاشماوەی ئەو نازناوانە بوو کە ئێرانییەکان سەپاندبوویان".[1]

ئەگەر ئێستا بێینەوە سەر تێڕوانین لەوێنە وسیفاتەکانی میر و سەرانی کورد لە دانراوە مێژووییە عێراقییەکاندا، دەبینین مێژوونووسە عێراقییەکان، وێنەی جیاجیامان لەبارەی ئەو میرانەوە پێشکەش دەکەن. ئەمەش بەگوێرەی هەڵوێستەکانیان لەهەمبەر دەسەڵاتدارێتی عوسمانی. ئەوەتا بە شان و شکۆی ئەومیرانەدا هەڵدەدەن کەخزمەتێکی ئەیالەتی بەغدا یان مووسڵیان کردووە، بەڵام بادەدەنەوە سەر هێرشکردنە بەسەر ئەو میرەی بەرهەڵستی دەسەڵاتی عوسمانی دەکات یاخود هەڵوێستێك وەردەگرێ کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی دەسەڵاتدارانی هەردوو ئەیالەتەکە یان دەسەڵاتدارێتی عوسمانی بەگشتی ناگونجێت. نەخاسمە کاتێك پەنا دەباتە بەر هێزی چەکدار و بەرامبەر بە هێزەکانی عوسمانی دەوەستێ. لەم بارەدا بە یاخیبوون تاوانبار دەکرێ و چەندین ناو و ناتۆرەی خراپی لێدەنرێ ، وەکو "ئەشقیا"[2] و "پیسی لەڕێ لادەر" و "گوناهکاری ناپاکی دۆڕاو". ئەم سیفەتانە خرانە پاڵ میر بەکر بەگی بابان، کاتێ لەساڵی ١٧١٤ دژی ئیالەتی بەغدا ڕاپەڕی.[3] هەرچی مەحمود پاشای بابانیشە،[4] کە لەساڵی ١٧٨٢هەڵوێستێکی هاوشێوەی وەرگرت، ئەوا عوسمان کوڕی سەنەد لەبارەی نووسیویەتی ودەڵێت: "لەو ساوە کەوەزیر [والی بەغدا] ناپاکی ئەوی بۆ ساغبۆوە وزانی ئایینەکەی وەلاناوە، فەرمانیدا بەئامادەکردنی لەشکر بۆ ئەوەی سەوزایی ئەم فێڵبازە لەناوببات... کاتێکیش ئەو بە لەشکرەکەیەوە لەکەرکووك دابەزی، وستەمکاریش بەکەموکوڕی و ڕاکێش ڕاکێش گەیشتە دەربەند [دەربەندی بازیان]...".[5] هەروەها

(١) تأريخ بغداد، ص١٣٨.

(٢) نظمي زاده، م. س، ص٣٢٨.

(٣) عبدالرحمن السويدي: حديقة الزوراء، ١٣٧. لەبارەی وردەکارییەکانی بزووتنەوەی ناوبراویش، بگەڕێوە بۆ: بۆ: سعدي عثمان، امارة بابان...، ص٢٤-٢٧.

(٤) مەحمود پاشای یەکەمی کوڕی خالید پاشایە. لەبارەی ژیاننامەی، بڕوانە: محمد امين زكي: مشاهير الكرد الكرد وكردستان، ج١، الآثار الكاملة للمؤلف، اعداد: رفيق صالح، السلمیانیة ٢٠٠٥، ص٣٩٧.

(٥) مطالع السعود، ص١٥٧.

کاتێك مێژوونووسی ناوبراو ڕووداوی ئابڵووقەدانی بەسرە لەنێو ڕووداوەکانی هەردوو ساڵی ١١٨٨ و ١١٨٩ك (١٧٧٤-١٧٧٥ز)دا دەگێڕێتەوە، نزا لە کەریم خانی زەند دەکات و دەنووسێت: "خودا باسك و لووتی قەومەکەی ببڕێت".[١] سلێمان فایق بەگیش کەباسی مردنی ئەم شایە ئێرانییە کوردە دەکات، دڵخۆشی خۆی ناشارێتەوەو دەڵێت: "بەمردنی پەتی دوژمنان پچڕا وکارەسات لەئاسمانی عێراق ڕەوییەوەو ناخۆشی لەسەر ڕەعیەت لاچوو".[٢] هەرچی یاسین عومەریشە بەهۆ هەندێ جاریش بەبێ هۆ تانە و تەشەر لە کورد ومیرەکانیان دەداو دەیەوێت بەگێڕانەوەی چەند ڕووداوێك کاڵای گەمژەیی بە باڵایاندا ببڕێ.[٣]

وێڕای ئەوەش، دانراوە مێژووییە عێراقییەکان وێنەگەلێکی پۆزەتیڤ وباشیان لەبارەی هەندێ لەمیرو سەرانی کورد تێدایە. تەنانەت مێژوونوسێکی عێراقی پاساو بۆ مەحمود پاشای بابان دەهێنێتەوە کاتێك سەرپێچی لە فەرمانەکانی ئیالەتی بەغدا دەکا، ئەوەتا دەنووسێت: "لەگەڵ ئەوەی کە مەحمود پاشا خەسڵەتگەلێکی باشی هەیە، بەلام مرۆڤ بگاتە پلەی کامڵبوونیش لەناتەواوی بەدوور نابێت".[٤] یاسین عومەری ئەگەرچی هەوڵدەدا لە نرخی میرانی بادینان کەم بکاتەوە —وەکو لەدێرەکانی پێشوو بینیمان - بەلام دەسەلمێنێ کەئەوان لەنێو دانیشتوانی میرنشینەکەدا پایەیەکی بەرزیان هەبوو.[٥] محەممەد ئەمین عومەری برایشی، دەڵێت میرانی بادینان "لە نێو کوردانی چیاکاندا وەك خەلیفەکان وابوون لە سەردەمی خۆیاندا".[٦]

هەندێك لە میرە کوردەکان لەلای بەرپرسانی موسڵ و بەغدا پلەو پایەیەکی گرنگیان هەبوو، بۆ نموونە میر محەممەد پاشای کوڕی خالید پاشای بابان لەساڵی ١٧٦٩ ئاشتەوایی

(١) م. ن، ص٨١.

(٢) تأريخ المماليك، ص ٢٩.

(٣) بڕوانە: غاية المرام، ص٩٢.

(٤) رسول الكركوكلي، م. س، ص١٧٦.

(٥) بڕوانە: غاية المرام، ص٩٣.

(٦) منهل الاولياء، ص٦٧،

کرد لەنێوان سەرانی بنەماڵەی جەلیلی کە لەموسڵ دەستڕۆیشتوو وحوکمڕان بوون.[1] دیارە هەندێ لەمیرانی بابانیش پەیوەندی هاوڕێیەتییان لەگەڵ عومەر پاشای والی بەغدا (١٧٦٤-١٧٧٥) هەبوو.[2] ئەمەش مەسەلەیەکی ئاسایی بوو، بەتایبەتی کەهەندێ لەبابانیەکان نیشتەجێی شاری بەغدا بوون. وەك: ئیبراهیم پاشا[3] ی بنیادنەری شاری سلێمانی، کە لەئەنجامی ئەمەدا "لەسەر خۆشگوزەرانی وژیانی بەختەوەری راهاتبوو" هەروەکو سلیمان فایق بەگ وادەڵێت.[4]

هەروەها ئازایەتی ونەبەردی لەو سیفەتە دیارانە بوون کەمیر وسەرانی کورد پێیان ناسرابوون، بۆیە مێژوونووسانی عێراقی ئەوەیان فەرامۆشنەکردووە کە لەچەندین شوێندا ئاماژەیان پێبدەن. ئەوەی جێی سەرسووڕمانە لەم بارەیەوە، ئەوەیە کەدەبینین یاسین عومەری، هەرچەندە بەوە ناسرابوو کە تیروتوانجی لەکورد دەگرت وەك پێشتر باسمان کرد، کەچی ئاماژە بە ئازایەتی میرە کوردێکی ئێزیدی دەدات، ئەویش میرزا پاشای داسنییە کە لەناوەڕاستی سەدەی حەڤدەمدا والی موسڵ بوو.[5] لەوەش سەیرتر، وەسفکردنی یەکێك لەمیرانی زەندە بە ئازایەتی ونەبەردی لەلایەن عوسمان کوڕی سەنەد، هەرچەندە لەکتێبەکەیدا زۆر بە توندی دژایەتی زەندەکانی کردووە.[6] هەر ئەم مێژوونووسە بەمیر عوسمان بەگی کوڕی مەحمود پاشای بابان هەڵدەداو دەڵێت "جوامێر و فریادڕەسە".[7] میری ناوبراو ستایشی سلێمان پاشای مەزنی والی بەغداشی بەدەستهێنابوو، بەهۆی ئەو رۆڵەی کە لەساڵی ١٧٨٠ لەبەرامبەر هەندێ لەیاخیبووان گێڕابووی، بۆیە والی "سوپاسی دڵسۆزی و ئازایەتی و نەبەردی ئەوی کرد" بەپێی دەربڕینی

(١) یاسین العمری، زبدة الآثار، ص١٢٧.

(٢) رسول الکرکوکلي، م. س، ص١٤٦.

(٣) ناوبراو کوڕی ئەحمەد پاشای بابانە، لەبارەی ژیاننامەی بڕوانە: محمد امین زكي، مشاهیر الكرد وكردستان، ص٦٨.

(٤) تأریخ بغداد، ص١٣٧.

(٥) مینة الادباء، ص٧٥.

(٦) بڕوانە: مطالع السعود، ص٨٩.

(٧) م. ن، ص١٧٦.

کەرکوکلی.[1] هەرچی مێژوونووس عەبدولرەحمان سوەیدیشە ئەوا سەرسام دەبێ بەتوانا جەنگییەکانی میر عوسمان پاشای کوردی ودەڵێت ئەو "پیاوێکە بەئازایەتی وەسفکراوەو لەنێو کۆمەڵدا بەگەڕناسی [الفراسە] ناسراوە"، ئنجا باسی رۆڵی ئەم میرە دەکات لە بەرپەرچدانەوەی عەشیرەتێکی عەرەبی یاخیبوو لەئیالەتی بەغدا لەساڵی ۱۷۳۸ ودەقاودەق دەنووسێت: "لەو رۆژەدا عوسمان پاشا شەڕێکی وایکرد لە چاویدا شەڕی عەنتەر بچووك دەبێتەوە، ئەوەندە بەڕێکی شمشێری لەپیاوان دەوەشاند کە ڕێك وەشاندنی رۆستەم لە پێشیدا شەرمەزار دەبێت وباسی ناکرێت. تا ئەو سەگسارانە وایاندەزانی ئەم پیاوە پێشەوای موسڵمانان ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو تالیبە و لە هێزو بازووی سەریان سووڕماو لە بڕشتی شمشێرەکەشی واقیان وڕماو هەلاتن...".[2] مێژوونووس عوسمان کوڕی سەنەدیش باسی رۆڵی محەممەد پاشای سەرداری کۆیە دەکات لە شەڕێکدا کە لەساڵی ۱۸۰۲ روویداوە، دەڵێت ئەو "شەڕێکی شێرانەی کرد".[3] قۆح پاشای میری سۆرانیش "پیاوێکی ئازا و شێرێکی لێهاتوو، خاوەن ڕەچەڵەکێکی خانەدان" بوو بەپێی وەسفی محەممەد ئەمین عومەری.[4] شایەنی باسە ئەم میرە سۆرانییە لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەمدا سەرداری کۆیە و پاشانیش هەولێر بووە و رۆڵێکی دلێرانەی گێڕاوە بۆ بەرگریکردن لە موسڵ لە سەروبەندی لەشکرکێشییەکەی نادرشا لەساڵی ۱۷٤۳. بەڵام لە ساڵی ۱۷٥۱ بەشداری لە ڕاپەڕینی سەلیم پاشای بابان کردووە و لەئەنجامی ئەمەدا کوژراوە.[5]

هەندێ لەمیرانی بابان لە سەرووی هەموویانەوە عەبدولڕەحمان پاشای بابان بەهۆی ئازایەتی و زەبرو دەسەڵاتی هەژمونێکی بەرچاوی لەناوچەکە بەدەستهێنابوو. ئەوەتا

---

(۱) دوحة الوزراء، ص۱۷۲.

(۲) حديقة الزوراء، ص٤۳۲-٤۳۳، وا مەزەندە دەکرێت ئەو میرە ناوبراوە ئەو سەردارە سۆرانیەی کۆیە بێت کەوا لەڕاپەڕینی سەلیم پاشای بابان بەشداری کرد و لەئاکامی ئەوەدا کوژرا، لەم بارەیەوە، بڕوانە: سعدي عثمان، امارة بابان...، ص٥٥-٥٧.

(۳) مطالع السعود، ص۲٤۷.

(٤) منهل الاولياء، ص۱٥۲.

(٥) بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە، بڕوانە: سعدي عثمان، امارة بابان...، ص٥٥-٥٨.

سلێمان فایق بەگ وەسفی دەکات بەوەی کە "یەکێك بوو لەدەستڕۆیشتووان و عەشیرەت وشوێنکەوتەی هەبوو".[١] ئەم میرە رۆڵێکی کاریگەری گێڕا لەو هەڵمەتە عوسمانییەی کە ئامانجی لابردنی سلێمان پاشای بچووك (١٨٠٧-١٨١٠) بوو لەپۆستی ئیالەتی بەغدا. لەگەرمەی ئەم رووداوانەشدا "عەبدولڕەحمان پاشا شەڕێکی قارەمانانەی کرد" بەپێی دەربڕینی یەکێك لەمێژوونووسان.[٢] بۆیە ناوبراو قسەی سوار وکاریگەر بوو لەدانانی والی نوێی ئیالەتی بەغدا واتە عەبدوڵڵا پاشا (١٨١٠-١٨١٢). سلێمان فایق بەگ لەم بارەیەوە دەنووسێ: "عەبدولڕەحمان پاشا بە ماڵ و بە پیاو سەریخست و چاکەی گەیاندنی [واتە گەیاندنی عەبدوللا پاشا] بەم پلەوپایەیە بۆئەو دەگەڕێتەوە".[٣]

### دووەم: هێزی سەربازیی کورد:

ئەگەر ئەو باس وهەواڵانەی لێ دەرکەین کە باسی شکستی بزووتنەوە کوردییەکانی دژ بەدەسەڵاتدارێتی عوسمانی دەکەن،[٤] ئەوا دەتوانین بڵێین کتێب و دانراوە مێژووییە عێراقییەکان پڕن لەو زانیارییانەی کەوێنەگەلێکی شەرافەتمەندانەی توانای شەڕکردنی کوردان دەخەنە روو. ئەوەتا زۆربەی مێژوونووسە عێراقییەکان تێبینی زۆریان تۆمارکردووە کە گوزارشت لە ئازایەتی و چەلەنگی کوردان دەکەن لە چەندین شوێن و حاڵەتەکاندا. بۆ نموونە: مێژوونووس و ئەدیبی موسڵ محەممەد ئەمین عومەری، لەمیانەی باسکردنی ئەو هێزانەی کەهاتن بۆ فریاکەوتن و سەرخستنی مووسڵ لە دژی لەشکرکێشییەکەی نادر شا لەساڵی ١٧٤٣، ناوی "شێرانی دەم و چاو گرژ [واتە بە سام وهەیبەت] " لەو (٥٠٠) سوارە کوردە دەنێ کەلەگەڵ قۆچ پاشای میری سۆران بوون.[٥]

---

(١) تأريخ بغداد، ص٣٢.

(٢) سليمان فائق، تأريخ المماليك، ص٤٢، لەبارەی وردەکارییەکانی ئەو رووداوانە بگەڕێوە بۆ: ياسين العمری، غرائب الأثر، ص١٠٩-١٢٠.

(٣) تأريخ بغداد، ص٤٠-٤١.

(٤) بۆ نموونە بڕوانە: رسول الكركوكلي، م. س، ص١٣٦، ياسين العمري، زبدة الآثار، ص١٠٧، عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص٢٧٧.

(٥) منهل الاولياء، ص١٥٢.

سلێمان فایق بەگیش لە وەسفی ئەو هۆزە کوردییانەی کە هاوکاری داود پاشایان کرد بۆ وەرگرتنی دەسەڵاتی ئیالەتی بەغدا لە ساڵی ١٨١٦، نووسیویەتی: ئەوانە "خاوەن ئازایەتییەکی لە ڕادەبەدەر و قارەمانیەتییەکی سەیرن".[1] هەر ئەم مێژوونووسەی دوایی لە شوێنێکی تر ئاماژە بەوە دەکا کە کوردان بە بوێری و نەبەردی ناوبانگیان دەرکردووە.[2]

دیارە سیفەتی ئازایەتی لەلای کورد ئەوەندە زاڵبووە، بەشێوەیەك مێژوونووسانی عیراقی سەردەمی عوسمانی هیچیان بۆ نەمابوو ئەوە نەبێ دان بەم ڕاستیە دابنێن، هەرچەندە مەسەلەکە پەیوەستیش بووبێ بەوهێزە کوردییانەی کە لەدژی دەسەڵاتدارێتی عوسمانی دەجەنگان. ئەوەتا مێژوونووسی بەغدایی عەبدولڕەحمان سوەیدی پاش ئەوەی بەچەندین ناو وناتۆرەی خراپ وەسفی بەکر بەگی بابان دەکات، چونکە لەساڵی ١٧١٤ دژی ئیالەتی بەغدا ڕاپەڕی، دەڵێت، ئەو "بەشوێنکەوتوانێکەوە پشت ئەستوورە کە وایکردووە ببنە سوپەر بۆی و بەسەربازانێکەوە دەوری قایم و پتەوە کەمرۆڤ و جنۆکە لە زیانیان بێبەش نابێ، ژمارەیان وەکو لیمە و کەرەستەی شەڕیان بەلێدان کێوان دەهەژێنێ" دوای ئەم زێدەڕۆییە پڕ لە سەروایەش ئەم جەنگاوەرانە بە پاڵەوان وەسف دەکات.[3] کەرکوکلی مێژوونووسیش ئاماژە بە بەرگری بەهێزی ڕۆڵەکانی هۆزی بلْباس دەکات،[4] کاتێ لە ساڵی ١٧٣٧ کەوتنەبەر هێرشی ئیالەتی بەغداو جەخت لەوە دەکات کە "ژنانی هۆزی ناوبراو بینراون شان بە شانی پیاوەکانیان تفەنگیان هەڵگرتووەو بەهەموو جەربەزییەکەوە لەسەربازەکانیان گرتووە".[5] لە شەڕی (کفری)یش (١٨١٢)

(١) تأريخ المماليك، ص٤٧.

(٢) تأريخ بغداد، ص٤٦.

(٣) حديقة الزوراء، ص١٣٧.

(٤) هۆزێکی گەورەی کوردە، تاوەکو نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەم لەشارەزوور نیشتەجێ بوون، بەڵام دواتر بەرەو کوردستانی ئێران کۆچیان کرد، بەهۆی ئەو گورزانەی کەلەلایەن عوسمانی و بابانەکان ئاراستەیان کرا، چەند لقێکیشیان لەچارەگی یەکەمی سەدەی دواتر لەناوچەکانی خۆرهەڵاتی هەولێر نیشتەجێ کران. بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: سعدي عثمان، كردستان الجنوبية، ص١٧٠-١٧٢.

(٥) دوحة الورزاء، ص٤٠، هەروەها بڕوانە: عبدالرحمن السويدي، حديقة الزوراء، ص٤٢٣.

کە تیایدا عەبـدولڕەحمان پاشـای بابـان ڕووبـەڕووی هێزەکـانی ئیالـەتی بەغـدا بـۆوە، لەدەستپێکی شەڕەکەدا هێزە بابانییەکان بەرخودانێکی وەهایـان کـرد کـە مێـژوونووس سلێمان فائق زۆر سەرسام بوو پێیان، لەئەنجامـدا نووسـیویەتی دەڵـێ: "عەبـدولڕەحمان پاشاو سـوارە ئازایـە فیـداکارەکانی هێرشـیان بـردە سـەر تۆپخانـەی حکومـەت و لـە شوێنەکانی خۆیان هەڵیانکەندن و باڵی ڕاست وچەپی لەشکرەکەیان تەفروتونا کرد بـەبێ ئەوەی باکیـان لـەو گوللـە تـۆپ و تفەنگانـە هـەبێت کـە بەسـەریاندا دادەبـاری".[1]

کـەرکوکلیش کەباسـی بـەرگریکردنی مـیر عوسمـان پاشـای سـۆرانی سـەرداری کۆیـە لەبەرامبەر هێزەکانی ئیالەتی بەغدا دەکات، دەڵێت: "خـۆی و پیاوەکـانی ئازایـەتی و نەبەردییەکی وایان پیشاندا کەوێنەی نەبێت". شایەنی وەبیرهێنانەوەیە، مـیری نـاوبراو بەشداری لەڕاپەڕینەکەی سەلیم پاشای بابان کـرد، بۆیـە لـە سـاڵی ١٧٥١ ڕووبـەڕووی شاڵاوێکی سەرکوتکەرانە بۆوە و لەئەنجامدا کوژرا.[2]

لەهەندێ لە دانراوە مێژووییە عێراقییەکاندا، چەند حاڵەتێکمان بەرچاو دەکەوێ کەتیایدا ژمارەیەکی کەم لەجەنگاوەرانی کورد توانیویانە سەر بکەون بەسەر هێزێکی نیزامی گـەورە. یاخود هێزێکی بچووکی کورد سەرکەوتن بەدەست دێنێ لەبەرامبەر لەشـکرێك کـە لـەڕووی ژمارە و چەك وکەرەستەوە چەندین جار بەقەد ئەو هێزە کوردییە دەبێ. بۆ نموونە مێژوونووس یاسین عومەری لەچەند دانراوێکیدا ڕووداوی میری ئێزیدی تەمەر (یان/نـەمر)ی کـوڕی سمـۆ دەگێڕێتەوە، کە خۆی و پێنج یـان حـەوت کـەس لـە سـوارەکانی هەڵمـەتیان بردۆتـە سـەر هێزەکانی والی مووسڵ عەبدولباقی جەلیلی کاتێ لە سـاڵی ١٧٨٦ هێرشـی کردبـووە سـەر شێخان، لەئەنجامدا والی و ژمارەیەك لە کەس و کاری وسەربازانی کـوژران و ئـەوانی تـریش تاسان هەڵاتن.[3] ئەحمەد پاشای کوڕی خالید پاشای[4] میری بابـانیش، بـە هێزەکـانی کـە

---

(١) تأريخ بغداد، ص٤٥-٤٦، شایەنی باسە لەکۆتایی ئەم شەڕەدا بابانەکان شکستیان خوارد، ئەگەرچی لە سەرەتای شەڕەکەدا سەرکەوتنیان بەدەستهێنا.

(٢) دوحة الوزراء، ص١١٧.

(٣) بڕوانە: غاية المرام، ص٣٣٠، زبدة الآثار، ص١٥٦. هەروەها بڕوانە: محمد امين العمري، م. س، ص١٩٦-١٩٧.

(٤) ناوبراو کوڕی خالید پاشای یەکەمە، لەبارەی ژیاننامەی، بڕوانە: محمد امين زكي، مشاهير الكرد و كردستان، ص٩٥.

نزیکەی دوو هەزار جەنگاوەر دەبوون، بەرەنگاری لەشکرێکی ئێرانی بۆوە کەژمارەی (١٢) هەزار جەنگاوەر بوو، ئەم لەشکرە لەساڵی ١٧٧٨ بە فەرمانی کەریم خانی زەند سنووری بابانیان بەزاندبوو. کەرکوکلی بەم شێوەیە هەڵوێستەکەمان بۆ وێنا دەکات ودەنووسێت: "کاتێك ئەحمەد پاشا بینی وڵاتەکە چی بەسەرهات، پیاوەتی و غیرەت گرتی و بەخۆی و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون هێرشی کردە سەر لەشکری ئێران و توانی پاشەکشەی پێ بکات و دیلەکان و ماڵ و سامان و گوندەکانیان بگێڕێتەوە".[1]

هەر لەم کتێب و دانراوانە تێبینی ئەوەش دەکەین کە هێزە کوردییەکان لەڕووی سەربازییەوە بۆ دەوڵەتی عوسمانی زۆر گرنگ بوون، نەخاسمە بۆ هەردوو ئیالەتی بەغداو موسڵ و بەتایبەتیش بۆ ئیالەتی یەکەمیان. ئەوەتا میروسەردارانی هەولێرو مەندەلی و کۆیەو هەریر و زەهاو و بادینان و بابان بەهێزەکانیانەوە بەشداریان لە سوپای ئیالەتی بەغدا دەکرد، کاتێك داوایان لێدەکرا. بەپێی خەملاندنەکانی سلێمان فایق بەگ میری بابان "دە هەزاری کۆدەکردەوە وئەوانی تریش لە نێوا دوو هەزار یان هەزار و پێنج سەد".[2] بەمەش دەکرێ بڵێین والیەکانی بەغدا لەکاتی ئەرکە سەربازییەکاندا، پشتیان بە کورد دەبەست بۆ کۆکردنەوە و ئامادەکردنی بەشی هەرە گرنگی لەشکری ئەیالەتەکە. بۆیە کوردەکان کارامەیی و لێهاتوویی سەربازیی خۆیان لە چەندین شوێندا سەلماندووە. بۆ نموونە خانە محەممەد بەگی میری بابان (١٧٢١-١٧٢٨) لەکاتی لەشکرکێشییەکانی ئیالەتی بەغدا بۆ سەر ئێران لە دەیەی سێیەمی سەدەی هەژدەمدا رۆڵێکی گرنگی گێڕا، بەهۆی ئەمەشەوە رێزی لێنرا. سلێمان فایق بەگ دەڵێت، ناوبراو بەپێی فەرمانێکی سوڵتانی میرنشینی ئەردەلان و پایەی (میری میران)ی بەدەستهێنا، چونکە "ئەو خزمەتانەی کە لە خۆی و خێڵە زۆرەکانی چاوەڕوان دەکرا، دیاربوون وخزمەتەکانی پێشووی بۆ هەمان بەرژەوەندی گەواهی ئەوەیان دەدا".[3] قۆچ بەگی میری سۆرانیش هەمان پلە و پایەی وەرگرت لە بەرامبەر ئەو رۆڵە قارەمانانەی کەگێڕای، کاتێك لە

---

(١) دوحة الوزراء، ص١٥٧-١٥٩.

(٢) تأريخ المماليك، ص٨٣.

(٣) حروب الإيرانيين...، ص١٠٢.

ساڵی ١٧٤٣دا شاری موسڵ لەلایەن نادرشاوە ئابڵووقەدرا.[١] چونکە لەو هێرشە فیداکارییەدا بەشدار بوو کە لە موسڵەوە دەرپەڕی بۆ بەرنگاربوونەوەی لەشکرەکەی نادرشا، پێش ئەوەی گەمارۆ بخرێتە سەر ئەم شارە. بەڕاستی کردارەکە سەرکەشییەکی پاڵەوانانە بوو، چونکە هێزێکی سوارەی چەند سەد کەسی، بەرەنگاری سوپایەك بۆوە کەچەندین هەزار دەبوو.[٢] هەروەها هێزەکانی بابانیش لەچوارچێوەی هەوڵەکانی ئیالەتی بەغدا بۆ دامرکاندنی بزووتنەوە یاخییەکەی عەجەم محەممەد،[٣] ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەیان هەبوو. دەبینین کاتێك بزووتنەوەکە لەساڵی ١٧٨٠ ڕەهەندێکی مەترسیداری وەرگرت وهەموو هەوڵە بەرایییەکان بۆ کپکردنی بە فیڕۆچوون، دەسەڵاتدارانی بەغدا هیچ ئومێدێکیان بە هێزە حکومییەکان نەما بۆیە ئەو بەرپرسەی کە ئەم ئەرکەی لە ئەستۆ گرتبوو، سوێندی خوارد کە"چیتر بە سەربازانی ڕۆم شەڕیان لەگەڵ نەکات"[٤]، "بەڵکو بە کورد یان عەرەبی ڕێزدار"، ئەوە بوو میری بابان بەخۆی و هێزەکانییەوە هات و "بەهاتنی ئیسلام شاد ودڵخۆش بوو، وەزیریش [واتە والی بەغدا] پشتی بە هێز بوو" بەپێی دەربڕینی عوسمان کوڕی سەنەد، کە ئەم جەنگاوەرە بابانییانە بەکەسانی "خاوەن دڵی زرێدار [واتە دڵ قایم]" وەسف دەکات. هەروەها بەچەند دێڕە شیعرێکیش ستایشیان دەکات و لەم دێڕانەدا بە شۆڕە سواری چاونەترس و نەڕەشێری مەیدان لە قەڵەمیان دەدات.[٥]

---

(١) محمد امين العمري، م. س، ص١٥٢.

(٢) ياسين العمري، منية الادباء، ص٢٧٥. عصام الدين عثمان العمري، م. س، ص٥١٦.

(٣) ئەم کەسە لەرەچەڵەکێکی فارسی نزم بوو، بەڵام بەچەندین شێوازی فرت و فێڵاوی لە بەغدا لای کاربەدەستان پلە و پایەی بەرزی وەرگرتبوو دواترینیان پایەی کەتخودایی بوو لە سەردەمی عەبدوڵڵا پاشای والی بەغدا (١٧٧٦-١٧٧٨)، دوای مردنی ئەم والییە هەوڵی دەدا پایەی ویلایەت بگرێتە دەست، کە لەمەشدا سەرنەکەوت، بزووتنەوەیەکی یاخیبوونی لە ناوچەکانی سەر بەئیالەتی بەغدا بەرپاکرد. بۆ وردەکاری زیاتر بگەڕێوە بۆ: عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص١٢٠ ومابعدها.

(٤) عبدالرحمن السويدي، تأريخ حوادث...، ص١٣٢.

(٥) بۆ دەقی شیعرەکە بڕوانە: مطالع السعود، ص١٢٥-١٢٧.

بەڵام پێویستە ئەوەش بڵێین کە هێزە کوردییەکان لە هەندێ شەڕدا پشتی دەوڵەتی عوسمانیان بەرداوە. لەم ڕووەوە بەتایبەت ئاماژە بە شەڕی (ئینجەدان) دەکرێ کە لە ساڵی ١٧٢٦ لە نێوان هێزەکانی ئیالەتی بەغدا و سوپای ئەفغانی لە نزیك ئەسفەهان روویدا. لەم شەڕەدا هێزە کوردییەکان بەهۆی پاشەکشەکردنیان لایەنی عوسمانییان تووشی شکستخواردن کرد.[١]

سەرەڕای ئەوەش دانراوە مێژووییە عێراقییەکان، ئامادەگی هێزەکانی کوردیان لە چەندین شەڕگەدا بۆ بەرژەوەندیی دەوڵەتی عوسمانی سەلماندووە، وەك بەشداربوونیان لەو شەڕانەی لەگەڵ ئێران قەوماون[٢] و هاوکاریکردنیان لە لەشکرکێشییەکانی دەسەڵاتدارانی عوسمانی بۆ سەرکوتکردنی یاخیبووان و کۆنترۆڵکردنی ئەو هۆز و عەشیرەتانەی لەدژی دەوڵەت رادەپەڕین. هەروەها بەشداربوونیان لەو ململانێیانەی لەسەر دەسەڵات پەیدا دەبوو، چ لە یەك ئەیالەتدا، یاخود لە نێوان بەرپرسانی چەند ئەیالەتێکی عوسمانیدا.[٣] لە چەندین باری تریشدا، دەبینی هێزی سەربازیی کورد بۆتە چەکوشێکی قورس بە دەستی بەرپرسانی عوسمانییەوە، بۆ لێدانی کورد خۆی و سەرکوتکردنی بزووتنەوەکانی، یان بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوتی مادی لەسەر حیسابی ئەوان.[٤] هەر ئەم دانراوانە ڕووداوگەلیکی تر لەخۆ دەگرن کە تیایاندا هێزی سەربازی لە ململانێ نێوخۆییەکانی نێوان میرنشینەکان و هۆز و عەشیرەتەکانی کورد، بەکارهێنراوە.[٥]

---

(١) عبدالرحمن السويدي، حديقة الزوراء، ص٢٨٣. رسول الكركوكلي، م. س، ص٢٢، سەبارەت بە وردەکارییەکانی ڕووداوەکە بڕوانە: سعدي عثمان، كردستان الجنوبية...، ص٢٩٦-٣٠٠.

(٢) بۆ نموونە بڕوانە: رسول الكركوكلي، م. س، ص٢٢. سليمان فائق، تاريخ بغداد، ص٧٣-٧٤. ياسين العمري، غاية المرام، ص١٨٥.

(٣) بڕوانە: نظمی زاده، م. س، ص٢١٥. عبدالرحمن سويدى، تاريخ حوادث، ص١٣٠، ١٣٧. عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص ١٧٦، ٢٧٣. ياسين العمري، غرائب الاثر، ص٩٢، ١٠٠.

(٤) بڕوانە: نظمی زاده، م. س، ص٢٠٤ ، ٢٩٦. ياسين العمري، غاية المرام،ص ١٨٥، ١٩١، ٢٠٦، هەروەها: زبدة الاثار، ص١٣١.

(٥) بڕوانە: رسول الكركوكلي، م. س، ص٢٢٩. ياسين العمري، غاية المرام، ص١٨٧، غرائب الأثر، ص٢٢، ٣٥، ٣٧، ٦٠.

لەکۆتاییدا گەرەکە بلێین، ئەوهێزە سەربازییە کوردییانە کە لەو کردانەدا ئامادەگی و بەشداربوونیان هەبوو، تەنها بریتی نەبوون لە هێزەکانی میرنشینە کوردییەکان، بەڵکو لەوێدا هێزەکانی هۆز و عەشیرەتە کوردییەکانیش هەبوون کە ئەوانیش بەپێی تواناکانیان بەشداریان لە رووداوەکان دەکرد.(١) هەروەها ئاماژە بە بوونی شەرڤانانی کوردی کرێگرتە لە ناو هێزەکانی ئیالەتی بەغدا دەکرێ، بەتایبەتی لەو هێزەی بە (لاوەند) ناسرابوو.(٢) هەروەها جەنگاوەرانی کوردی خۆبەخشیش هەبوون. چونکە پاڵنەری ئایینی و کۆشش بۆ بەدەستهێنانی پاداشتی جیهاد هانی هەندێ خەڵکیان دەدا بۆ بەشداربوون لەکردە سەربازییە عوسمانییەکاندا، بەتایبەت لە دژی لایەن و کۆمەڵە ناموسڵمانەکان. بۆ نموونە ئەوددەمەی عەلی پاشای والی بەغدا (١٨٠٢-١٨٠٧) لە ساڵی ١٨٠٢ لەشکری کردە سەر کوردانی ئێزیدی لە شنگار "لە کوردان خەڵکانێکی خۆبەخشی زاهید و دینداری لەگەڵدا بوو... کوردەکان، نەخاسمە خۆبەخشەکان گیانیان بۆ خودا بەخشیبوو" وەك چۆن عوسمان کوڕی سەنەد گوزارشتی لێوە دەکات.(٣) لە بواری جیهاد، شێخێکی زاهیدی خەڵکی ئاکرێ لە ناوچەی بادینان ناوبانگی دەرکرد، کە ئەویش پیر رەجەبی کوڕی حەسەنی زێباری کوردی بوو. ئەوەبوو کاتێك وڵاتی میسر ڕووبەڕووی داگیرکردنی فەرەنسییەکان بۆوە، شێخی ناوبراو بەخۆی و (٢٠) پیاوی

---

(١) بۆ نموونە بڕوانە: رسول الكركوكلي، م. س، ص٢٤٧. ياسين العمري، غرائب الأثر، ص٥١، ٥٧.

(٢) سليمان فائق، تأريخ المماليك، ص٢٣پەراوێز. لاوەند: لەواژەی (Lavantino)ی ئیتاڵی هاتووە، کە ڤینیسییەکان بەو دەریاوانە رۆژهەڵاتیانەیان گوتووە کە لە کەشتییەکانیان بەرکاریان هێناون و عوسمانییەکانیش بۆ دەریاوانە بەراییەکانی خۆیان بەکاریان هێناوە. کاتێکیش ئەو دەریاوانانە لە خزمەت مەرەخەس کران، پەنایان بردەبەر هەرێمە جیاجیاکانی دەوڵەت و خزمەتەکانی خۆیان بەرامبەر بە پارە خستەڕوو ئیتر بوونە سەربازی کرێگرتە. لە عێراقیش ناویان بە کوردەوە گرێدرابوو چونکە بەزۆری لە کورد پێکدەهاتن. د. طارق نافع الحمداني: ملامح سياسية و حضارية في تأريخ العراق الحديث و المعاصر، ط١، بيروت ١٩٨٩، ص١١٠-١١٢.

(٣) مطالع السعود، ص٢٤٧.

کوردەوە بۆ ئەو وڵاتە سەفەری کرد و چووە ریزی سوپای عوسمانییەوە بـۆ شـەڕ لـە دژی فەرەنسییە داگیرکارەکان.[1]

## سێیەم: بزووتنەوەو ڕاپەڕینە کوردییەکان:

لە سۆنگەی ئەو فاکتەرە خودییەی کە لە بەرز ڕاگرتنی هێز و ئامادەگی بەردەوام بۆ قوربانیدان لە کۆمەڵگەی کوردیدا، خۆی دەنوێنێ،[2] و ئەو بارودۆخە بابەتییەی کە لـەو ڕەوشە سیاسییەی لەسەردەمی عوسمانیدا لە کوردستان باوبوو، بەرجەستە دەبێ، زۆرجار کورد پەنایان بردۆتە بەر چەك و ئـاگری ڕاپـەڕینیان لـە دژی دەسـەڵاتدارێتی عوسمـانی هەڵگیرساندووە.[3] بەلام مێژوونووسە عێراقییـەکان وێنەیـەکی راسـتەقینەیان لـەبارەی زۆربـەی ئـەو بزووتنـەوەو ڕاپەڕینـە کوردیانـە نەکێشـاوە. چـونکە دیـدێکی بێلایـەن ودادپەروەرانەیان لەهەمبەر ڕووداوەکاندا نەبووە، لەبەرئەوەی زۆربەیان گوزارشـتیان لـە بیروبۆچوونی دەسەڵاتدارێتی عوسمانی دەکرد، وەك لە سەرەتای ئەم توێژینەوەیەدا گوتمان، بۆیە دەبینین بە چەندین ناو و ناتۆرەی خراپ وەسـفی ئـەو بزووتنەوانـەیان دەکـرد، وەك "فەرمان شکاندن"[4] یـان "یـاخیبوون و فـەرمان شـکاندن"[5] و (گوێڕایەڵنـەبوون بـۆ فەرمانەکان)[6] و "دەرچوون بەرامبەر بە دەسەڵات" یان ئەنجامدانی "کردەوەگەلێك لـە دژی دەوڵـەتی عوسمـانی".[7] هەنـدێ لـەو مێژوونووسـانە پەنادەبەنەبـەر داڕشـتنی دەستەواژەی ئەدەبی وبەکارهێنانی شێوازگەلی ڕەوانبێژی بـۆ وەسـفکردنی هەنـدێ لـەو

---

(١) یاسين العمری، غرائب الأثر، ص٥٨، بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ئەم شێخە، بگەڕێوە بۆ: عماد عبدالسلام، دراسات وثائقية...، ص٣١٩-٣٢٩.

(٢) لەم بارەیەوە بڕوانە: باسيلي نيكيتين، الكرد/ دراسة سوسيولوجية و تاريخية، ت: د. نوری طالبانی، ط١، دار سبيريز، مطبعة خاني، دهوك ٢٠٠٨، ص١١٧-١٢١.

(٣) سەبارەت بەهۆکار وسیماکانی ئەم ڕاپەڕینانە بڕوانە: سعدي عثمان، كوردستان الجنوبية...، ٢٤٥- ٢٤٨.

(٤) ياسين العمري، غاية المرام، ص١٨٥، ١٨٩. هەروەها بڕوانە: زبدة الآثار، ص١٢١.

(٥) نظمی زاده، م. س، ص٣٢٨. رسول الكركوكلي، م. س، ص١١٦.

(٦) رسول الكركوكلي، م. س، ص١١٦، ٢٤٢.

(٧) م. ن، ص٩٣، ١٣٥.

بزاڤە کوردییانە. وەك سلێمان فایق بەگ کە سەبارەت بە ڕاپەڕینەکەی عەبدولڕەحمان پاشای بابان، نووسیویەتی دەڵێت: "ئاڵای یاخیبوونی بەرامبەر بە حکومەتی ناوەند لە بغدا، هەڵکرد"[1]. عوسمان کوڕی سەنەدیش کە بەشێوازە پڕلەسەروایەکەی بەناوبانگە، دەربڕینی وەکو "یاخیبوون و زۆرداری" و "ناپاکی و وەلانانی ئایین" بەکاردێنێ بۆ وەسفکردنی هەندێ لەم بزووتنەوانە. ناوبراو لەبارەی ڕاپەڕینی میرێکی بابانەوە دەڵێت: "ئاگری گەندەڵی هەڵایساند، ئەوەی تالانی کرد تالانی کرد، دەستی بەهەموو هۆکارێکی خراپەکارییەوە گرت".[2] بەڵام یەکێك لە مێژوونووسەکان، فرمانی "شۆڕشی کرد"ی بەکابردووە کە لە چاوگی (شۆڕش)ەوەیە، بۆ وەسفکردنی کردەوەکانی سلێمان پاشای بەبەی میری بابان و فراوانخوازیەکانی لەسەر حیسابی هەرێمەکانی دەوروبەر و ڕاوەستان لە دژی دەسەڵاتدارێتی عوسمانی".[3] لە ڕاستیشدا کردەوەکانی ئەم میرە دەخرێتە چوارچێوەی زاراوەی (شۆڕش) بە هەموو واتایەکی ئەم زاراوەیە. چونکە هەوڵی داوەو تێکۆشاوە بۆ دامەزراندنی قەوارەیەکی هەرێمی سەربەخۆ لەسەر بناغەی میرنشینەکەیدا.[4]

ژمارەیەك لە مێژوونووسە عیراقییەکان کاڵای دەستدرێژیکەری تاوانباریان کردووە بە باڵای میرە شۆڕشگێڕە کوردەکانداو والی و بەپرسانی عوسمانییان وەکو فریادڕەس وێناکردووە. بۆ نموونە نەزمی زادە لەبارەی بزووتنەوەکەی بەکر بەگی بابان، نووسیویەتی دەڵێت: "لەم ساڵە نێوبراوەدا [١١٢٦ك/١٧١٤ز] سنجەقی بەبەی بەکر ناو کەسەر بە ناوچەی شارەزوورە لەڕێ دەرچوو و یاخیبوونی لە دژی والی ناوچەی ناوبراو جاڕدا و ژمارەیەك لە خزم و پیاوەکانی کوشت و لێرە و لەوێ پەلاماری دەبرد و ڕێگری دەکرد و دەستدرێژیی دەکردە سەر بێتاوانان و بۆ تەمبێکردنی، وەزیر ڕووی لەم ناوە کرد...".[5]

---

(١) تاريخ بغداد، ص٣٠.

(٢) مطالع السعود، ص٢٧٦، ١٥٧، ٣٣٣.

(٣) نظمي زاده م. س، ص٢٩٦.

(٤) بۆ وەستان لەسەر وردەکارییەکانی ئەم شۆڕشە، بگەڕێوە بۆ: عماد عبدالسلام: دراسات وثائقية...، ص١١٣، ١٣٦. سعدي عثمان: كوردستان الجنوبية...، ص٢٤٩-٢٥٣.

کرد..."[1] عەبدولڕەحمان سوەیدیش بە ناوەڕۆکێکی هاوشێوە بەڵام بە دەربڕینێکی پڕ لەسەروا هەواڵەکانی ئەم بزووتنەوەیەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: "بەکر بەگ یاخیبوو... کاتێ سەرپێچی نواند و ئەم دەوروبەر و ئەو قۆڵانەی گرت، نە گوێڕایەڵی والییەکانی شارەزووری کرد و نە بەدوای گووتەی جەماوەر کەوت. چەندان پیاوی کوشت و ئەتکی کرد و ژن و منداڵی بەتاڵانبرد و لەژێر سمی ئەسپەکانیدا گیانی منداڵانی تێکشکاند و ئاودێری کرد کاتێ جامی نەمانی بەخەڵکی گوندان نۆشی بۆیە وەزیری بەتوانا ویستی ئەم خەمە لەسەر موسڵمانان هەڵگرێ".[2]

هەرچی پەیوەستیشە بە هۆکارەکانی بزووتنەوەو ڕاپەڕینە کوردییەکانەوە، ئەگەرچی مێژوونووسانی عێراقی زانیاری ڕوون وئاشکرامان پێ نادەن، بەڵام لەمیانەی ئەو باسانەی دەیانگێڕنەوە، دەتوانین لەسەر هۆکارەکانی ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان کورد و دەسەڵاتدارێتی عوسمانی ڕابوەستین. دیارە هەستانی میرانی کورد بەفراوانکردنی چوارچێوەی دەسەڵاتیان لە پێشەوەی ئەو هۆکارانەوە بووە. ئەوەتا لەبارەی ڕاپەڕینی سلێمان بەبەوە، نەزمی زادە دەڵێت، ئەوان "هێرشیان کردە سەر شارەزوور و گرتیان و یاخیبوونیان پەلی هاویشت، تەنانەت هێندەی نەمابوو کەرکوك داگیربکەن".[3] کە دێتە سەر باسی بزووتنەوەکەی بەکر بەگی بابانیش، ئەم مێژوونووسە دەنووسێت کەناوبراو "لێرەو لەوێ هەڵمەتی دەبرد...".[4] سەبارەت بە هۆکارەکانی وەستانی عەبدولڕەحمان پاشای میری بابانیش لە دژی ئیالەتی بەغدا، عوسمان کوڕی سەنەد باسی ئەوە دەکات کەمیری ناوبراو دەستی تاوانی درێژکرد و سوپای بەڕێخست بۆ داگیرکردنی هەولێر.[5] بڕێ جاریش، ئەو فراوانخوازییانە لە چوارچێوەی هەوڵ و تێکۆشانی میرەکانی کورد بۆ جیابوونەوە لە دەوڵەتی عوسمانی، ئەژمار دەکران، ڕەنگە هەندی جار ئەمەش بە پشتیوانی هێزێکی دەرەکی نەخاسمە ئێران بووبێت. باشترین نموونە بۆ ئەمە ڕاپەڕینی

---

(١) گلشن خلفا، ص٣٢٨.

(٢) حديقة الزوراء، ص١٣٦.

(٣) گلشن خلفا، ص٢٩٦.

(٤) م. ن، ص٣٢٨.

(٥) مطالع السعود، ص٢٧٦.

سەلیم پاشای بابانە لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەمدا. چونکە کەرکوکلی لە بارەی کارەکانی ئەم میرەوە، ئەم دەقەی نووسیوەو دەڵێت: "خۆی لە ئێرانییەکان دەبردە پێش و بەڕێککەوتننامە پەیوەندی لەگەڵیاندا دەبەست... لەم دواییەشدا لەگەڵ موتەسەڕیفی کۆیسنجەق عوسمان پاشا ڕێککەوت و جیابوونەوە و سەربەخۆیی جاڕدا، ئیدی هەردووکیان بە کەیفی خۆیان لە ناوچە کوردیەکە پەلاماریان دەبرد و دەسووڕانەوە و وردە وردە دەستیان بەسەردا دەگرت".[1] لەبارەی ئەو ڕاپەڕینە بەرفراوانەشەوە کە میری بابان عوسمان پاشای کوڕی مەحموود پاشا تیایدا بەشدار بوو لەگەڵ موتەسەڕیفی بەسرە مستەفا ئاغای کوردی و ژمارەیەك لە سەرکردەکانی تر لە ساڵی ١٧٨٨، ئەوە بۆ یارمەتیدانی "موتەسەڕیف بوو لەوەی کەویستی، ئەویش داگیرکردنی عێراق و مەڵبەندەکەی واتە شاری بەغدا بوو" بەپێ دەربڕینی عوسمان کوڕی سەنەد.[2] کە ئەمەش پڕۆژەیەکی گەورەتر بوو لە فراوانکردنی بازنەی دەسەڵاتی میرنشینێکی کوردی.

هەروەها چەندین بزووتنەوەی تریش لە ئارادا بوون کە بەهۆی ڕابوونی میرێکی کورد لە دژی دەسەڵات،[3] یاخود ڕەتکردنەوەی فەرمانەکانی بەرپرسانی عوسمانی و مەرجەکانیان بەرپا دەبوون. وەك میر مەحموود پاشای بابان کە بە گوتەی عوسمان کوڕی سەنەد "ڕازی نەبوو لەبەغدا چاوی بە وەزیر بکەوێت، کاتێك ئەوەی لێ داواکرد" لەساڵی ١٧٨١.[4] ، یان "لەجێبەجێکردنی فەرمانەکان کەمتەرخەمی دەکرد و ساردی و بێزاری دەنواند" بەپێی گوزارشتی کەرکوکلی.[5] هەندێ لە مێژوونووسانیش ئاماژە بە بە چەند دەستێکی شاراوە دەکەن کە هانی هەندێ لە میرەکانیان داوە لە دژی دەسەڵاتدارێتی عوسمانی بوەستن، جا ئەو دەستە شاراوانە کەسایەتیگەلێکی بەرپرس

---

(١) دوحة الوزراء، ص١١٦.

(٢) مطالع السعود، ص١٨٠.

(٣) بۆ نموونە بڕوانە: رسول الكركوكلي، م. س، ص١٣٥.

(٤) مطالع السعود، ص١٥٢.

(٥) دوحة الوزراء، ص١٧٤. سەبارەت بە نموونەی تر بڕوانە: م. ن، ص ٢٤٢. عثمان بن سند الوائلي، م. س، س، ص١٥٦.

بووبن لەدەوڵەتدا،[1] یان هێزی دەرەکی کە ئەویش ئێرانە.[2] زۆر حاڵەتی دیکەش هەن کە لەمیانەیاندا بزووتنەوەیەکی دژ بە دەوڵەت لەسەر بنەمای هەڵوێستێکی تاکەکەسی بەرپابووە، مەبەستمان لەمە هەوڵەکانی سەرانی کوردە لە پێناو گەیشتن بە دەسەڵات یان دەستگرتن بە کورسی دەسەڵاتەوە، لەبەرامبەر فەرمانێك کە عوسمانییەکان دەریانکردووە بۆ لابردنیان.[3] هەندێ لەبزووتنەوە کوردییەکانی تریش لە بنەڕەتدا بریتی بوون لە کردەوەگەلێکی یاخیبوون و ڕێگری و لە یاسا دەرچوون، ئەم کردەوانەش بەزۆری لەلایەن هۆزو عەشیرەتە بەهێزەکانەوە ئەنجام دەدران، وەکو هۆزی مللی بە سەرۆکایەتی تەیمور پاشا، کە لەسەرەتاکانی دەیەی کۆتایی سەدەی هەژدەمدا سەرکردایەتی بزووتنەوەیەکی بەرفراوانی دەکرد لە دەڤەرەکانی ماردین، ئەم بزووتنەوەیە بە شێوەیەك تەشەنەی کردبوو، کەپێویستی بەهەوڵ وتوانای زۆربوو بۆ لەناوبردنی.[4]

لەکۆتاییشدا دانراوە مێژووییە نێوبراوەکان زانیاریگەلێکمان پێدەبەخشن کەبەدیاری دەخەن هەڵوێستی میللیش فاکتەرێك بووە لە فاکتەرەکانی هەڵایسانی بزووتنەوە و ڕاپەڕینە کوردییەکان. بۆ نموونە لەساڵی ١٨٠١ خەڵکی هەولێر لە دژی سەرداری شارەکەیان ڕاپەڕین کە لەلایەن والی بەغدا دامەزرابوو، بەهۆی ئەو زوڵم و زۆرەی لە خەڵکی شارەکەی دەکرد. دوای ئەوەی ئەم سەردارەیان شاربەدەرکرد، خەڵکەکە شاندێکیان پێکهێنا بۆ ڕوونکردنەوەی هەڵوێستیان لەلای والی. بەڵام والی لە بری ئەوەی دادپەروەرانە بڕوانێتە کێشەکەیان، فەرمانی دوورخستنەوەی ئەندامانی شاندەکەی دا بۆ بەسرە.[5] هەشت ساڵ بەر لەم ڕووداوە، حاڵەتێکی تری هاوشێوە لە شاری ماردین روویدا، بەڵام لێرەدا خەڵکی شارەکە ئامانجی خۆیان بەدەستهێناو ئەوە بوو سەردارێکی

---

(١) بڕوانە: رسول الكركوكلي، م. س، ص٢٤١.

(٢) بڕوانە: سلێمان فائق بك، تاريخ بغداد، ص١٤.

(٣) بڕوانە: رسول الكركوكلي، م. س، ص١٤٥، ١٧٧. ياسين العمري، منية الادباء، ص٧٥.

(٤) بڕوانە: رسول الكركوكلي، م. س، ص١٩٤. ياسين العمري، غرائب الأثر، ص٢٣. زبدة الآثار، ص١٦٤-١٦٧.

(٥) ياسين العمري، غاية المرام، ص١٩٨، غرائب الأثر، ص٥٩.

تر لەسەر شارەکە دانرا. هەرچەندە ئەوان سەرداری پێشووی شارەکەیان کوشتبوو لەگەڵ هاریکارەکانی بەهۆی ئەو ستەمکارییەی کە دەیانکرد.[1]

بەچاوخشاندن بەدانراوە مێژووییە عێراقییەکاندا، سەرنج دەدەین کەدەسەڵاتدارێتی عوسمانی لە چەند بارێکی دەگمەندا، شێوازی ئاشتییانەی پیادە کردووە لە هەمبەر ئەو بزووتنەوە و ڕاپەڕینە کوردییانە. ئەو شێوازانەش بە زۆری لەشێوەی (ئامۆژگاری وفەرمایشت) یان (ئامۆژگاری و ڕێنمایی کردن) بوو.[2] یانیش "تەماکردن جارێك و ترساندنیش جارێکی تر" بوو.[3] واتە لە هەندێ باردا سیاسەت لەگەڵ هێز و ترساندن یەکانگیر بووە. بەڵام شێوازە باوەکە خۆی لە ناردنی هەڵمەتی سەربازی و سەرکوتکردنی بزووتنەوەکان بە بەکارهێنانی هێز، دەبینیەوە.[4] بەرپرسانی عوسمانیش، بەتایبەت والییەکانی بەغدا هەوڵیاندەدا هەموو ئەو هێزە سەربازییەی لەتوانایان دایە کۆیبکەنەوەو سوود لە گشت چەك و تواناکانی بەردەستیان وەربگرن، لەم هەڵمەتانەدا. بۆیە لەزۆربەی ئەم هەڵمەتانەدا هێزەکانی هەندێ ویلایەتی دەوروبەر، بەتایبەتی موسڵ[5] و شارەزوور،[6] هەروەها میر و سەرانی کوردی دڵسۆزی دەوڵەت دەبینران.[7] دەبینران.[7] هەندێ هەڵمەتیش، هێزەکانی ویلایەتی تر و ژمارەیەك لە هۆزە عەرەبییەکانی لەخۆدەگرت، وەکو هەڵمەتی والی سلێمان پاشای مەزن بۆ دامرکاندنی

---

(١) ياسين العمري، غرائب الأثر، ص٣٣.

(٢) رسول الكركوكلي، م. س، ص١٣٥، ١٧٥.

(٣) نظمي زاده، م. س، ص٢٩٦.

(٤) بۆ نموونە بڕوانە: م. ن، ص٣٢٨. رسول الكركوكلي، م. س، ص١٣٦، ٢٤٢. عثمان بن سند الوائلى، م. س، ص٢٠٣.

(٥) بۆ نموونە بڕوانە: ياسين العمري، غاية المرام، ص١٨٥. زبدة الآثار، ص١٢١، محمد امين العمري، م. س، ص١٦٧. شایەنی گوتنە والی بەغدا ویستی والی موسڵ سزا بدات، چونکە لەیەکێك لەو هەڵمەتانەدا لەساڵی ١٨١٢ دواکەوت. بڕوانە: عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص٢٧٧.

(٦) بڕوانە: رسول الكركوكلي، م. س، ص٢٣٧-٢٣٨. ياسين العمري، غرائب الأثر، ص ٧٨، ٨٧.

(٧) بۆ نموونە بڕوانە: نظمي زاده، م. س، ص ٢٠٤، ٢٩٧. رسول الكركوكلي، م. س، ص ١٧٧. عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص١٥٦.

بزووتنەوەکەی تەیمور پاشای مللی لە ساڵی ١٧٩١، کە هەردوو والی موسڵ وئۆرفە بەخۆیان و هێزەکانیانەوە هاتنە پاڵی، هەروەها هێزەکانی میرنشینی بابان و ژمارەیەك هۆزی عەرەبی تیایدا بەشداربوون و ژمارەی هێزەکان گەیشتە (٣٠) هەزار شەڕکەر.[١] بۆیە عوسمان کوڕی سەنەد نووسیویەتی دەڵێت: والی "بە لەشکرێکی یەکجار گەورەوە غەزای کرد و ئابڵووقەیدا و هیچ رێگایەکی هەڵاتنی لە پێشدا نەما".[٢] هەروەها لە ساڵی ١٥٥٢ هەڵمەتێکی زەبەللاحی عوسمانی لە هێزەکانی ویلایەتەکانی سیواس و حەلەب و بەغدا لەگەڵ ژمارەیەك لە میرنشینە کوردییەکان پێکهات، بۆ هێرشکردنە سەر میرنشینی ئەردەلان کە لە بازنەی گوێڕایەڵبوون بۆ دەوڵەتی عوسمانی دەرچوو.[٣] بەمەش دەبینین عوسمانییەکان سوودیان لە هێزە کوردییەکان وەرگرتووە بۆ سەرکوتکردنی بزووتنەوە و راپەڕینە کوردییەکان. بەڵکو هەندێك لە مێژوونووسەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە والییەکانی بەغدا هەوڵیان دەدا تۆوی دووبەرەکی و ناکۆکی لە نێو یەك میرنشینی کوردیدا بچێنن، بۆ لەناوبردنی ئەو بزووتنەوەیەی لە دژی دەسەڵاتدارێتی عوسمانی بەرپابووە. کەرکوکلی ستایشی ئەم سیاسەتە دەکات کاتێ دەنووسێ والی "بە رێگایەکی تری جیا لەرێگای پێکداهەڵچوون لەجەنگدا بۆیان دەچێت، ئەویش بەوەی، نامە بۆ هەندێ لە کوڕانی میرەکانی کوردستان دەنووسێ و بۆ لای خۆی رایاندەکێشێت، هیوای بەخشینی پلەو پایە و نیشانیان پێدەدات".[٤]

گێڕاوەکانی ژمارەیەك لە مێژوونووسانی عێراقی ئەوە دەسەلمێنن کە زۆربەی بزووتنەوەو راپەڕینە کوردییەکان بەتوندی سەرکوتکراون، هاوکات لەگەڵ ئەو سەرکوتکارییانەدا لەزۆربەشیان کردەوەگەلی تالاّن و بڕۆ و هەندێ جاریش یەخسیرکردنی ژن و منداڵ ئەنجامدراوە. بۆ نموونە کاتێك بزووتنەوەکەی بەکر بەگی بابان لە ساڵی ١٧١٤ لەناوبرا، "کوشتار گەرم بوو لەنێویاندا و سەربازەکان زۆربەی ژن و منداڵ

---

(١) ياسين العمري، غرائب الأثر، ص٢٣-٢٤.

(٢) مطالع السعود، ص٢٠٣.

(٣) نظمي زاده، م. س، ص٢٠٤.

(٤) دوحة الوزراء، ص١٧٥، هەروەها بڕوانە: م. ن، ص١٧٧، عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص١٥٤، ١٥٧.

ومەڕوماڵاتیان بە دەستکەوت بـرد" بـەپێی دەربڕینـی عەبـدولڕەحمان سـوەیدی.[1] لـە میانەی لەشکرکێشی بۆ سەر هۆزی (مللی)ش، سوپای هێرشـبەر دەسـتیگرت "بەسـەر دەستکەوتێکی زۆر کە لەژماردن نایەت، پیر و ژن و منداڵیشیان بە دیـل بـرد".[2] کـە هێزەکانی عەبدولڕحمان پاشایش لە شەڕی کفری شکان، عوسمان کـوڕی سـەنەد دەڵێـت: "لە کەللە سەری لەناوچوو وسـەربازە کوژراوەکـانی بـەرزاییی دروسـتکرد".[3] دەبیـنین لەهەندێ باریشدا بەرپرسـانی عوسمـانی بـە غـەدر وشـێوازی نامەردانـە مـیرە کـوردە ڕاپـەڕیوەکانیان خسـتۆتە داوە، کـاتێکیش کەوتوونەتـە بەردەسـتیان بـێ بەزەییانـە کوشتوویانن. وەکو ئەوەی لەگەڵ بەکر بەگی بابان و سەلیم پاشای بابان و عوسمان پاشای سۆران کردیان.[4] ژمارەیەکیش لە میرەکان دوای ئەوەی خۆیان بەدەستەوە داوە، مەرجی سەختیان بەسەردا سەپێنراوە، وەکو سزاو غەرامەی جەنگی گران و ڕادەستکردنی یەکێك لە کوڕەکانیان بۆ ئەوەی ببێتە بارمتە لای دەسەڵاتدارانی عوسمانی.[5]

بەڵام ئەوەی لە دانراوە نێوبراوەکاندا زیـاتر تێبینـی دەکـەین، هـەڵاتنی سـەرکردەی بزووتنەوەکەیە بەرەو ئێران[6] کە بە پەناگەیەکی ئاسـوودە دادەنـرا بـۆ مـیر و سـەرانی کوردی بەرهەڵستکاری دەوڵەتی عوسمانی، بەتایبەت میرانی بابان. ئەوەتا سلێمان فـایق بەگ دەڵێت: "مەیلی بابانییەکان بۆ ئێران مەسەلەیەکی ڕوونی حاشاهەڵنەگرە".[7]بەڵام حاشاهەڵنەگرە".[7]بەڵام مەسەلەکە تەنها لە مـەیل و پەیـداکردنی پەناگـە خـۆی مـت

---

(١) حديقة الزوراء، ص١٣٧.

(٢) رسول الكركوكلي، م. س، ص١٩٥، لێرەدا پێویستە بگوترێ، والی بەغدا دوای ئەوە بەزەیی بە پیرو ژن و منداڵەکاندا هاتۆتەوە و ئازادی کردوون.

(٣) مطالع السعود، ص٢٧٧.

(٤) بڕوانە: عبدالرحمن السويدي، حديقة الزوراء، ص١٣٧، نظمي زاده، م. س، ص٣٢٨. رسول الكركوكلي، م. س، ص١١٧، ياسين العمري، غاية المرام، ص١٨٣.

(٥) بڕوانە: رسول الكركوكلي، م. س، ص١٧٦.

(٦) بۆ نموونە بڕوانە: م. ن، ص١٣٧. ياسين العمري، زبدة الآثار، ص١٢١ و سليمان فايق، تاريخ بغداد، ص٣٠.

(٧) تاريخ بغداد، ص٤٢، سوەیدی دەڵێت: سەلیم پاشای بابان "ماوەیەکی درێژ و ساڵانێکی زۆر سەر بە عەجەم بوو. حديقة الزوراء، ص٥٩٠.

نەدابوو، بەڵکو ئەم میرانە بە پەنابردنیان بۆ ئێران دەیانویست پایەکانی خۆیان بەدەست بێننەوە. ئەوەش یان بەهۆی نێوبژیوانی بەرپرسانی ئێرانی، یانیش بە وەرگرتنی لەشکر لە ئێران بۆ ئەوەی بەهێز بگەڕێنەوە بۆ سەر حوکمی میرنشینەکانیان.(١) بە گوتەی هەندێ لە مێژوونووسە عیراقیەکان، ئێرانییەکانیش هەوڵیان دەدا لەرێگەی میرە کوردەکانەوە تەماح و ئامانجەکانیان لە دەوڵەتی عوسمانی بەدەست بێنن. لەم بارەیەوە، سلێمان فایق بەگ ئاماژە بەوە دەدات کە ئێرانییەکان "بەلای محەممەد پاشا [بابان] داچوون... بۆ راکێشانی و بەڵێنی شیرینیان پێداوەو لەگەڵیدا رێککەوتوون بۆ داگیرکردنی عێراق"(٢). بەڵام هەردوو مێژوونووس عەبدولڕەحمان سوەیدی و ڕەسول کەرکوکلی لەوەدا زێدەڕۆییان کردووە کاتێك دەڵێن سەلیم پاشای بابان دەستیداوەتە نامە گۆڕینەوە لەگەڵ بەرپرسانی ئێران بۆ وەرگرتنی هێزی نیزامی تا بەغدای پێ بگرێ و ڕادەستی ئەوانی بکات.(٣)

لەنێو ئەو مێژوونووسە عێراقییانەدا، تەنها سلێمان فایق بەگ هەڵوێستێکی بابەتییانەی وەرگرتووە و هۆکارەکان و سروشتی پێوەندی نێوان میرە کوردەکان و ئێرانی شرۆڤە کردووە. سەبارەت بە مەیلی سەلیم پاشای بابان بۆ ئێران، ناوبراو دەڵێت مەسەلەکە "بەهۆی ناپاکی نیشتمانی، یان لەپێناو پایەو دەسەڵات نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە نادرشا لەشکرە فرە وگەورەکانی بەرەو ئەم وڵاتە ناردبوو و چاوی بڕیبووە داگیرکردنی. لەبەر ئەوەی ئەوانیش توانای بەرەنگاربوونەوەیان نەبوو... بۆیە سەلیم پاشا رووی کردە لای نادر شا تاوەکو رزگارکردنی ئەم خانەوادە موسڵمانانە لە مردن و دەربەدەری مسۆگەر بکات و ئابڕوو و گیانیان لە دڕەندەیی نادر شا و سەربازەکانی بپارێزێت...".(٤) لە شوێنێکی تریشدا، سەرسووڕمانی خۆی لە هەمبەر پەنابردنی عەبدولڕەحمان پاشای بابان بۆ ئێران دەردەبڕێ، بەڵام دواجار پاساو بۆ هەڵوێستەکەی

---

(١) بۆ نموونە بڕوانە: م. ن، ص ٣٠، ٤٦. عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص١٤١. ياسين العمري، غرائب الأثر، ص٧١، ٧٢.

(٢) تاريخ بغداد، ص١٤.

(٣) حديقة الزوراء، ص٥٩١. دوحة الوزراء، ص٩٣.

(٤) تاريخ بغداد، ص١٣٧-١٣٨.

دەهێنێتەوە، کە دەڵێت: "من پێم سەیرە کەسێکی وەکو عەبدولڕەحمان پاشا کە لە بنەماڵەی بابانە و بابانیش شوێن و پایەیەکی بەرزی لەنێو خەڵکدا هەیە... بەم تەرحە خۆی نزم بکاتەوە و پەنا بەرێتە بەر بێگانە و دوای ئەوان بکەوێ، بەڵام ئەم سەرسووڕمانە دەڕەوێتەوە ئەگەر بزانین کە والی بۆتە هۆکاری ئەوەی ناوبراو ناچار بێت ئەم ڕێگا سەختە بگرێتە بەر بە قەبوڵکردنی پەنابردن و خۆهاوێشتنە باوەشی بێگانە و داواکردنی یارمەتیان، ئەمەش لە ئاکامی خراپی ئیدارەی والییەوەیە...".[1]

**چوارەم: ڕووداوە سیاسییەکانی کوردستان:-**

ئەوەی لە دانراوە مێژووییە عێراقییەکاندا هەیە لە بارەی ڕووداوە سیاسییەکانی کوردستان لە سەردەمی عوسمانیدا، بە زۆری بریتییە لەو ڕووداوانەی کە دەخرێنە چوارچێوەی پەیوەندییەکانی دەوڵەتی عوسمانی بە ئێرانەوە، یان پەیوەندییەکانی قەوارە کوردییەکان بە دەوڵەتی عوسمانی و ویلایەتەکانییەوە، بەتایبەت هەردوو ویلایەتی بەغدا و موسڵ. چونکە مێژوونووسە عێراقیەکان ڕووداوگەلی شەڕەکانی دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانیان لە کوردستان، تۆمارکردووە و ڕۆڵی کوردیان لەو شەڕانە، چ لە وڵاتەکەیان یان لە دەڤەرەکانی تری هەردوو دەوڵەتەکە، بەدیارخستووە. بۆ نموونە نەزمی زادە، دێتە سەر باسی بەسەرهات و کاروباری کوردستان لە دوای شەڕی چالدێران و توندبوونی ململانێی عوسمانی - ئێرانی لە سەردەمانی سوڵتان سەلیمی یەکەم (١٥١٢-١٥٢٠) و سوڵتان سلێمانی قانونی (١٥٢٠-١٥٦٦).[2] ئەم مێژوونووسە و ژمارەیەك لە مێژوونووسانی تر باسی ئەو گۆڕانکارییانە دەکەن کە لەسەروبەندی جەنگی ساڵانی ١٦٠٢-١٦٣٩ بەسەر ناوچەکەدا هاتوون، بە تایبەت هێرشەکانی شا عەباسی سەفەوی کە لە ساڵی ١٦٢٣بە داگیرکردنی بەغدا وهەڵکشانی دەسەڵاتی سەفەوی بەرەو ناوچەکانی کوردستانی باشوور، گەیشتنە ترۆپك. پاشان باس لە بەشداربوونی کورد لە هەوڵ و کۆششەکانی عوسمانییەکان دەکەن بۆ سەندنەوەی بەغدا، لەنێویشیاندا هەڵمەتەکەی سوڵتان مورادی چوارەم (١٦٢٣-١٦٤٠) کە توانی لە ساڵی ١٦٣٨

(١) م. ن، ص٣٤-٣٥.

(٢) بڕوانە: گلشن خلفا، ص١٨٥- ١٨٦، ١٩٧، ٢٠٢- ٢٠٤.

ئامانجی خۆی بەدەست بێنێ.[1] لەمیانەی باسکردنی لەشکرکێشییەکانی دەوڵەتی عوسمانیش بۆ سەر ئێران لە دەیەی سێهەمی سەدەی هەژدەمدا، هەردوو مێژوونووس سلێمان فایق بەگ و ڕەسول کەرکوکلی ئاماژە بە چالاکیەکانی کورد و ئەو هێزە سەربازییانەیان دەدەن کە ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەیان بینی لە هەندێ لەشەڕەکاندا، نەخاسمە لە دەستبەسەراگرتنی هەردوو شاری کرماشان و هەمەدان و گرتنی هەردوو میرنشینی ئەردەلان و لوڕستان. هەروەها دێنە سەر باسی ئەو هەڵوێستە نەگەتیڤەی کە هێزە کوردییەکان لە بەرامبەر سوپای عوسمانی لە شەڕی (ئینجەدان) لە ساڵی ١٧٢٦ گرتیانەبەر و ئاکامەکەی ئەوە بوو عوسمانییەکان خراپ تێکشکان. هەردوو مێژوونووس هەولێشیان داوە هۆکارەکانی ئەم ڕووداوە بخەنەڕوو.[2] زۆرێك لە دانراوە مێژووییە عێراقییەکان باس و هەواڵی لەشکرکێشییەکانی نادرشایان بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی و بەتایبەت بۆ سەر ئیالەتە عێراقییەکان تۆمارکردووە. هەر لەو میانەدا هاتوونەتە سەر باسی بەو نەهامەتیانەی کە لە ئاکامی ئەم لەشکرکێشیانە بەسەر ناوچە کوردنشینەکاندا هاتوون و لەپاڵ ئەمەشدا هەڵوێستی کوردیان لەم سەروبەندەدا ڕوون کردۆتەوە.[3] یەکێك لەو مێژوونووسانەی کە هاوچەرخی ڕووداوەکان بووە، دەڵێت لە کاتی ئابلۆوقەدانی بەغدا لەلایەن نادر شا لە ساڵی ١٧٣٣، کورد لەگەڵ توێژەکانی تری دانیشتوانی ئەم شارە دەرد و مەینەتی گرانی و برسێتییان چێشتووە.[4] هەرچی یاسین و براکەی محەمەد ئەمین عومەریشە، ستایشی ڕۆڵی هێزەکانی قۆچ پاشای سۆرانیان کردووە لە بە هاناوە چوونی شارکەیان (موسڵ) لە سەروبەرندی ئابلۆقەدانەکەی ساڵی

---

(١) م. ن، ص٢١٨-٢٢٥، ياسين العمري، زبدة الآثار، ص٦٦-٧٠، غاية المرام، ص٩٣، محمد امين العمري، م. س، ص١٣٦-١٣٨.

(٢) بڕوانە: سليمان فائق بك، حروب الايرانيين...، ص١٠١-١١١، رسول الكركوكلي، م. س، ص١٩-٢٧، ياسين العمرى، غاية المرام، ص١٧٨.

(٣) بڕوانە: رسوول الكركوكلي، م. س، ص٢٩-٣٥، ٥٠، ياسين العمرى، زبدة الآثار، ص٨٨-١٠٣، منية الأدباء، ص١٧٨-١٨٣، محمدامين العمري، م. س، ص١٤٧-١٥٥.

(٤) عبدالرحمن السويدي، حديقة الزوراء، ص٣٥٢.

١٧٤٣دا.[١] یەکێك لەئەدیبانی موسڵیش ئەرەجۆزەیەکی (لەشێوەی بەیتی فۆلکلۆرییە) لەبارەی ڕووداوەکانی دوا هەڵمەتی نادر شا بۆ سەر شاری موسڵ هۆنیوەتەوە، لە نێو بەیتەکانی ئەم ئەرەجۆزەیەدا چەند زانیارییەکمان دەداتێ لەبارەی ڕۆڵی کورد و ئەو کارەساتەی بەسەر ناوچەکەیاندا هات لەماوەی ئەم هەڵمەتەدا.[٢] هەندێ لە پیاوانی ئایینی مەسیحی هاوچەرخی ڕووداوەکانیش، وردەکاری چڕوپڕیان لەبارەی ئەو کردەوە دزێو و چەپەڵانە تۆمار کردووە، کە هێزەکانی نادرشا لە دەڤەرە کوردنشینەکان و ناوچەکانی تری سەرەڕێی هەڵمەتەکە ئەنجامیاندا. هەروەها ئەو ئاکامانەشیان بە دیارخستووە کە هەڵمەتەکە لەدوای خۆی جێیهێشتووە، بە تایبەت لە هەردوو لایەنی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە.[٣] یەکێك لەو پیاوە ئایینییە مەسیحییانە کە ناوی قەشە (حەبەش کوڕی جومعە) یە و خەڵکی قەرەقوش بوو، لە ساڵی ١٧٤٥ نووسیویە، دەڵێت: "لە سەرەتای هاتنی فارسەکان بۆ ئەم ناوچەیە ...تا مانگێك ئارامیمان نەبینی و ترس و لەرز لە دڵمان نەڕەوییەوە بەهۆی ئەو هەواڵە ترسناکانەوە کە پڕوپاگەندەیان هەموو ڕۆژێك بڵاودەبوونەوە. و لەبەر ئەوانەی بەرگوێمان دەکەوتن لەهەواڵی بەدیلبردنی خەڵکی کە لە شوێنەکانی نزیکمان ڕوویاندەدا. هەروەها بەکاریگەری برسێتی و قاتوقڕی کە هەموو شوینێکیان تەنیبوو".[٤]

هەرچی ئەو پێکدادان و شەڕانەشە کە لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران لە هەردوو سەردەمی زەندی و قاجاریدا ڕوویاندا، کەکاریگەریی ڕاستەوخۆیان بۆ سەر کوردستان هەبوو، بەو پێیەی ببووە گۆڕەپانێکی سەرەکی بۆ ئەو پێکدادان و شەڕانە، ئەوا ڕووداوەکانیان لە زۆربەی دانراوە مێژووییە عیراقییەکاندا تۆمارکراون. نەخاسمە ئەو هەڵمەتانەی کەریم خانی زەند لە حەفتاکانی سەدەی هەژدەمین بەرەو ناوچەکانی

---

(١) منية الادباء، ص٢٨١، منهل الاولياء، ص١٥٢.

(٢) (عصام الدين عثمان العمري) بەشێکی گرنگی ئەم ئەرەجۆزەیەی لە کتێبەکەیدا داناوە، بڕوانە: الروض النظر...، ج١، ص ٥١١-٥١٦.

(٣) بڕوانە: نرسيس صائغيان، م. س، ص٣٧٩-٣٨٣، بطرس حداد، م. س، ص٦٤-٧٢، سهيل قاشا، م. س، ق١، ص١٥٦-١٦٠، ق٢، ص١٥٢-١٥٧.

(٤) سهيل قاشا، م. س، ق٢، ص ١٥٥.

کوردستانی باشوو ئاراستەی کردن.[1] بەڵکو یەکێك لەو دانراوانە بەڵگەی ئەوە بەدەستەوە دەدات کە کوردان بەشدارییان کردووە لە بەرگریکردن لە شاری بەسرە، کاتێك زەندییەکان لەساڵی ١٧٧٥ ئابڵوقەیانداوە.[2] جێگەی سەرنجە کە مێژوونووس سلێمان فایق بەگ، دەرکی بە فاکتەری نەتەوەیی کردووە لەو جەنگەدا، کاتێك ئاماژەی بەوە داوە کە "زۆربەی دانیشتووانی شارەزوور لە نەتەوەی کوردن و خاوەنی ئێرانیش کەریم خانی زەندە کە یەکێکە لە میرە کوردەکان".[3] هەروەها دەستێوەردانەکانی قاجارییەکان لە کاروباری کوردستان و قەومانی شەڕ و پێکدادان لەنێوان هەردوو دەوڵەتی ئێران و عوسمانی لە ئاکامی ئەوەدا، جێگەی بایەخپێدانی مێژوونووسانی عێراقی بوون، بەتایبەت ڕەسوول کەرکوکلی و سلێمان فایق بەگ، کە وردەکاریگەلێکی گرنگمان لەبارەی ئەو ڕووداوانە دەدەنێ و هەڵوێستی سەرانی کورد لەمیانەی ئەم ڕووداوانەدا بەدیاردەخەن.[4]

لەسەر ئاستی ڕووداوە ناوخۆییەکانی کوردستانیش، زۆربەی مێژوونووسانی عێراق بایەخیان بە گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانە داوە کە بەتایبەتی پێوەندییان بە دەسەڵاتدارێتی هەردوو ئیالەتی بەغدا و موسڵەوە هەبوو. بۆیە ئەو دانراوە مێژووییانەی ئەم مێژوونووسانە نووسیویانن، پڕن لە باس و هەواڵی شەڕ و ململانێی میرانی کورد لەگەڵ دەسەڵاتدارانی هەردوو ئیالەتەکە و ئەو پەلامار و هێرشە سەرکوتکارییانەی ئەم دەسەڵاتدارانە ئەنجامیان دەدا بۆ دامرکاندنی بزووتنەوە کوردییەکان و دووبارە دەستبەسەراگرتنی قەوارە کوردییەکان.[5] بڕێ جاریش، مێژوونووسە عێراقییەکان بە دواداچوونیان بۆ باس و هەواڵی میرانی کوردی

(١) بڕوانە: رسول الكركوكلي، م. س، ص١٤٨-١٥١، ١٥٧-١٦٣، ١٥٩-١٦٤، ياسين العمري، غاية المرام، ص١٨٥-١٨٧، زبدة الآثار، ص١٣٨، سليمان فائق بك، تاريخ المماليك، ص٢٦-٢٩.

(٢) عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص٨٦، ١١٤.

(٣) تاريخ المماليك، ص٢٧.

(٤) بڕوانە: دوحة الوزراء، ص ٢٣٦-٢٣٧، ٢٥٢، ٢٥٧، ٢٨٤-٢٨٥، ٢٩٥-٢٩٨، تأريخ بغداد، ص١٤، ٣٠، ٣٢، ٤٧، هەروەها بڕوانە: عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص٣٢٩، ياسين العمري، غرائب الأثر، ص ٧١، ٧٢، ٧٧.

(٥) بۆ نموونە بڕوانە: نظمي زاده، م. س، ص ٢٠٤-٢٠٥، عبدالرحمن السويدي، حديقة الزوراء، ص ١٣٦-١٣٧، ياسين العمري، غاية المرام، ص ٩٧، عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص ١٥٦، سليمان فائق بك، تاريخ بغداد، ص ٣٠.

پەنابردوو بۆ ئێران دەکرد لەو وڵاتــەدا.[1] جگــە لــەوەش دانراوەکانیــان زانیاریگــەلێکی پوختیان لەخۆ گرتووە سەبارەت بەو گۆڕانکارییانەی دەسەڵاتدارانی عوسمانی لە پۆســتی سەرکردایەتی میرنشــین و قــەوارە کوردییەکانــدا دەیــانکرد، هــەروەها ئــەو ململانــێ و کێشانەش کە لە ئەنجامی ئەمەدا چ لە نێوان میر و سەرانی کورد خۆیان یــان لــە نێــوان ئەو میرانە و دەسەڵاتدارە عوسمانییەکان ڕوویاندەدا.[2] هەموو ئەم مێژوونووســانەش بــە دوور و درێژی و هەندێجاریش بەوردی باس وخواسی ئەو لەشکرکێشییانەیان نووسیوە کە هەردوو ئیالەتەکە کردوویانەتەسەر هۆزە کوردییەکان و کوردانی ئێزیدی. بــەڵام زۆرجــار لە تاوانبارکردنی ئەم هۆزانە و ئێزیدییەکان زێدەڕۆییان کــردووە و کردەوەکــانی تــاڵان و دزی و ڕێگرییان خستوونەتە پاڵ. لەکاتێکدا هێزە حکومییەکان خۆیان لەمیانــەی کــرد سەربازییەکانیاندا لــە کوردســتان و ناوچــەکانی تــر هــەمان کردەوەیــان ئەنجامــداوە.[3] هەروەها زانیارییەکانی دانراوە مێژووییە نێوبراوەکان دەسەڵمێن کە کــوردان بــەخۆیان و هێزە ســەربازییەکانیان بەشــداری زۆریــان کــردووە لــە کــردە ســەربازییەکانی هــەردوو ئیالەتەکە، وەکو لە لاپەڕەکانی پێشوو باسمان کرد.[4]

لەکاتێکدا کە زۆربەی مێژوونووسە عێراقییــەکان تــەنها گرنگییــان بــەو لایەنانــەی مێژووی کوردستان داوە کە ئاماژەمان پێکردن، دەبیــنین مێژوونووســی موســڵی یاســین عومەری لەم پێودانگە لایداوە. چونکە ئەو جیا لە مێژوونووسانی تر، لــە دانراوەکانیــدا (بەتایبەت لە: غرائب الڵپر و زبــدە الآپــار)دا باســی ڕووداوە مێژووییــە نێوخۆییــەکانی کوردستان دەکات، بەبێ ڕەچاوکردنی پەیوەستبوونی ئەو ڕووداوانە بەهێزە نێودەوڵەتی و

(١) بڕوانە: رسول الكركوكلي، م. س، ص١٧٨-١٧٩.

(٢) بۆ نموونە بڕوانە: م. ن، ص ١٤٦، ١٩٢، ٢٢٨-٢٢٩، عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص ٢٥٤، ياسين العمري، غاية المرام، ص١٩٨-١٩٩، ٢٠٤، ٢٠٥.

(٣) بۆ نموونە بڕوانە: نظمي زادە، م. س، ص ٣٢٨-٣٣٠، رسول الكركوكلي، م. س، ص ١٩٤-١٩٥، ٢٤٥، عثمان بن سند الوائلي، م. س، ص٢٠٣-٢٠٤، ياسين العمرى، غاية المرام، ص ٢٠٢، غرائب الأثر، ص ٢٣، ٣٣، ٣٥، ٦٣.

(٤) بڕوانە: نظمي زادە، م. س، ص٢١٥ و سليمان فائق بك، تاريخ بغداد، ص٤١، حروب الايرانيين...، ص١٠٨، تاريخ المماليك، ص ٤١-٤٢، ٤٦-٤٧، ٦٣-٦٤، رسول الكركوكلي، م. س، ص ١٨٥.

هەرێمییەکانەوە. هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پێوەندییە توند و تۆڵانەی کە لە ڕووی جوگرافی و مێژووییەوە موسڵیان بە ناوچەکانی کوردستان بەستۆتەوە، ئەمە سەرباری پێوەندییە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کلتوورییەکان و هەروەها ئەو پێوەندییە سیاسی و کارگێڕییانەش کە لەنێوان هەردوولا لەئارادابوون. هەروەها عومەری لەم دوو کتێبەیدا هەوڵیداوە مێژووی گشتی سەرلەبەری ناوچەکە تۆمار بکات و تەنها بە نووسینی مێژووی ئیالەتێکی دیاریکراوەوە پابەند نەبووە وەك ئەوەی مێژوونووسەکانی تر وایان دەکرد. بۆیە ناوبراو زانیاریگەلێکی گرنگی بۆ بەجێهێشتووین، کەخزمەتی نووسینی مێژووی سیاسی کوردستان دەکەن، بەتایبەتی لە چارەگی کۆتایی سەدەی هەژدەهەم و چارەگی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا. ئەوەتا عومەری چەندین ڕووداوی کوردستان تۆمار دەکات، وەك: ململانێیەکانی میرانی بنەماڵەی حوکمڕان لە نێو یەك میرنشینی کوردیدا، بەتایبەت میرنشینی بادینان کە لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم چەندین گێرمە و کێشەی نێوخۆیی بەخۆوە بینی.[1] چەندین زانیاریشمان لەبارەی ئەو کێشە و پێکدادانانە پێدەدا کە لە نێوان میرنشینە کوردییە جیاجیاکان دەقەومان، وەك ئەوەی لە نێوان هەردوو میرنشینی بابان و سۆران[2] و هەروەها لە نێوان بادینان و شێخان ڕوویدا.[3] یاخود ئەو ڕووداوانەی کە لە نێوان میرنشینەکان و عەشیرەتە کوردییەکان دەقەومان، وەك ئەو شاڵاوەی عەبدولڕەحمان پاشای بابان لە ساڵی ١٧٩١ بردیە سەر هۆزی بڵباس، ئنجا دوای پێنج ساڵ ئاشتەوایی لەگەڵدا کردن و لە ئێرانەوە هێنایانیەوە.[4] هەروەها دەستدرێژی عەشیرەتی مزوری بۆ سەر میرەکانی بادینان لە ساڵی ١٨٠٤دا.[5] لەوێدا، چەند باس و هەواڵێکیش هەن لەبارەی پەلامار و ململانێ خێڵەکییەکان، چ لە نێوان خێڵ و عەشیرەتە کوردییەکان

---

(١) بڕوانە: غرائب الاثر، ص١٨، ١٩، ٢١، ٣٦، ٤٧، زبدة الآثار، ص١٦٠- ١٦٣، غاية المرام، ص٩٨.

(٢) غرائب الاثر، ص٥٧، ٦٠، ١٢١.

(٣) م . ن ، ص٢٣، ٢٦- ٢٧، ٥٣.

(٤) م. ن ، ص٢٦، ٤١.

(٥) م. ن، ص ٦٦، سەبارەت بە ڕووداوی تری لەم بابەتەش، بڕوانە: م. ن، ص٣٧، زبدة الآثار، ص١٧٦، غاية المرام، ص٢٠٣.

خۆیان، یان لـه نێـوان هـۆزه کوردییـهکان و عهرهبییـهکان.[1] کتێبـی (غرائـب الْپـر) زانیاریگەلێکی له خۆگرتووه سەبارەت بـەو کێشـه و راپەڕینانـەی کـه لـه نـاو شـار و شارۆچکه کوردنشینەکان له دژی سەردار و میرەکان بەرپابوون، وەك ئـەو کێشـانەی لـه شاری عێنتاب روویاندا، یان ڕاپەڕینی خەڵکی جزیره لـه دژی مـیری بۆتـان.[2] کتێبـی (غایه المرام)یش چەندین زانیاری تری تێدایه، وەکو: دیاریکردنی دەسەڵات و هـەژمونی هەندێ له میرانی کورد، و ئـەو دەسـتدرێژییەی جووەکـان کردوویانەتـە سـەر پیرۆزییـه ئیسلامییەکان له شارۆچکەی زاخۆ.[3]

له دوماهیـدا، پێویسـته ئـەوه بلـێین کـه عومـەری لـه کتـێبی (غرائـب الْپـر)دا هەڵوێستێکی نەگەتیڤی بەرامبەر به کـورد و هەنـدێجار میرەکانیشـیان، گرتۆتـه بـەر، نەخاسمه کاتێك دێته سەر باسـی ئـەو کێشـانەی کـه لـه نێـوان میرنشـینی بادینـان و دەسەڵاتدارانی موسڵی سەر به بنەماڵەی جەلیلی ڕوویاندەدا،وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا. هەر لەمیانەی ئەمەدا عومەری چەند پەندێکی هێناوەتەوە، که نازانین ئایا له داهێنانی خۆیەتی، یان لەو سەردەمەدا له موسڵ باو بوون، وەکـو: "هەڵسـان و دانیشـتن لەگـەڵ کوردان خراپی بەدواوەیە" و "هەر کاتێك بینیت کورد دەسەڵاتدارە، چـاوەڕێی قیامـەت بکە" و "سەلامەتی لەش وبەدەن بەخۆ دووخستنەوە دەبێ لـه کـوردانی بادینـان" یـان "میوه له کوردان وەرگره و گاڵتەوگـەپیان لەگەڵـدا مەکـە" و چـەندانی تـر. هـەروەها ناوبراو کوردیشی به نەزانی و گەمژەیی وەسفکردووه و کردەوەگەلێکی بەدەر لەڕەوشـت دەخاته پاڵ هەندێ لـه کەسـایەتییەکانیان. لـه چـەند شوێنێکیشـدا بـۆ خزمـەتکردنی مەبەسـتەکانی شـیعری هێناوەتـەوە.[4] بـەڵام ئـەم هەڵوێسـتەی هـیچ لـه گرنگـی زانیارییەکانی لەمەڕ ڕووداوه سیاسییەکانی کوردستان کەم ناکاتەوە.

### پوختەی توێژینەوەکە:

---

(١) غرائب الأثر، ص ٢٢، ٢٥، ٣٥، ٥١، ٥٨، ٩٦، زبدة الآثار، ص ١٦٣-١٦٤، ١٧٤-١٧٥.

(٢) بڕوانه: ص٢٣، ٢٥، ٢٩، هەروەها بڕوانه، ص٣٩، ٦٤، ١٢٣.

(٣) بڕوانه: ص٩٩، ١٠٠.

(٤) بڕوانه: ص ٨١، ١٠١، ١٠٧-١٠٨.

هەرچەندە زانستی مێژوو لە عێراقی عوسمانی سستبوونێکی ڕێژەیی بەخۆوە بینی، بەڵام چەند دانراوێکی مێژوویی لەم سەردەمەدا نووسران، کە بوونە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ تۆمارکردنی مێژووی ناوچەکە لەم سەردمەدا، لەوانە: کتێبی (گلشن خلفا) لە دانانی نەزمی زادە مورتەزا ئەفەندی و (دوحە الوزراو)ی مێژوونووس ڕەسول حاوی کەرکوکلی و (مگالع السعود) لە دانانی عوسمان کوڕی سەنەدی وائیلی بەسری. هەروەها دانراوەکانی یاسین عومەری، بەتایبەت (غرائب الڵپر) و (الڵپار الجلیە) و (غایە المرام). دەکرێ بێژین ئەم دانراوانە بە سەرچاوەی یەکەمی دەگمەن دێنەژماردن بۆ وەستان لەسەر بارودۆخی سیاسی کوردستان لە سەردەمی عوسمانیدا، چونکە سەرچاوەی ترمان بەدەستەوە نییە کە لەگرنگیدا بگەنە ئەو ئاستە.

لەو کتێب و دانراوانەدا، ئەو جیاووك ئیمتیازاتە سیاسییە-کارگێڕییانە ڕەنگیان داوەتەوە کە کوردستان لە سەردەمی عوسمانیدا هەیبوو، ئەویش لەو ئاماژە زۆرانەی کە بۆ قەوارە کوردییەکان دەکرێن. ئەوەتا ناوی ئەم قەوارانە بە شێوازی جیاجیا هاتووە، وەك "میرنشین" و "حکومەت" و "سنجەق" و "موتەسەڕفییەت". میرانی کوردیش بە میر یان حاکم یان بە موتەسەڕیف ناودەبران. نازناوی "پاشا" یش دەخرایەپاڵ ناوی زۆربەیان، ئەمەش بەڵگەی ئەوەبوو کە ئەم میرانە پلەی (میری میران) یان هەبوو، بەتایبەت ئەو میرانەی فەرمانڕەوایی میرنشینە کوردییەکانیان دەکرد لە دەوڵەتی عوسمانیدا. ئەو میرە کوردانەش کە سەر بە ئێران بوون، نازناوی "خان" یان هەڵگرتبوو. سەبارەت بە وێنەی میر و سەرانی کوردیش لەو کتێب و دانراوە مێژووییانەدا، دەبینین وێنەکەیان بەپێی هەڵوێستیان لە دەسەڵاتی عوسمانی دەگۆڕێت. ئەوەتا ستایشیان دابارانەدووە بەسەر ئەو میرانەی پشتگیری دەوڵەتی عوسمانییان کردووە، کەچی هەڵوێستێکی نەیار وخراپیان بەرامبەر ئەو میرانە وەرگرتووە کە دژایەتی ئەم دەوڵەتەیان کردووە. زۆرجاریش مێژوونوسە عیراقییەکان میرانی کوردیان بە نەبەردی و ئازایەتی و خاوەن توانا وەسف کردووە. هەروەها لە دانراوە مێژووییەکانیاندا گرنگی هێزی سەربازیی کوردیان سەڵماندووە، لە میانەی گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانەی کە ئازایەتی و قارەمانێتی کورد لە شەڕەکاندا دەردەخەن. تەنانەت ئەگەر لە سەنگەری دژایەتیکردنی

دەوڵەتی عوسمانیشدا بووبن. بەڵام ئەو حاڵەتەی کە لە دانراوەکاندا زیاتر باوە، سوود وەرگرتنی عوسمانییەکانە لە هێزە سەربازییەکانی کورد لە چەندین بواردا.

وەلێ، دانراوە مێژووییە عێراقیەکان، وێنەگەلێکی راستگۆییانە بە دەستەوە نادەن لەبارەی ئەو بزووتنەوە و ڕاپەڕینە کوردییانەی کە لەو سەردەمەدا بەرپابوون. چونکە زۆربەی مێژوونووسە عێراقییەکان گوزارشتیان لە تێڕوانینی عوسمانییەکان دەکرد لە گێڕانەوەی رووداوەکاندا، و پابەندی بنەمای بێلایەنی نەبوون کە لە ئێستادا بە کۆڵەگەیەکی سەرەکی دادەنرێ لەمێژوونووسیندا. لەئەنجامدا بزووتنەوە کوردییەکانیان بە سەرەڕۆیی و یاخیبوون و ناپاکی لە قەڵەم داوە، و سەرکردەو بەشداربووەکانیشیان هێناوەتە ڕیزی دز و جەردە و ڕێگرەکان، بەچاوپۆشین لەپاڵنەری بزووتنەوەکان وهۆکارەکانی بەرپابوونیان. بەڵام مێژوونووسانی عێراقی وێنەگەلێکی ڕاستەقینە دەگوێزنەوە لەبارەی شێوازەکانی سەرکوتکردن و ئەو توندوتیژییەی پەیڕەو دەکران لەکپکردنی بزووتنەوە کوردییەکان. بەڵام سەبارەت بە پێوەندییەکانی میرانی کورد بە ئێرانەوە، مێژوونووس (سلێمان فایق بەگ) جیا لە مێژوونووسەکانی تر، هەوڵی شرۆڤەکردنی ئەم پێوەندییانە دەدات، بۆ ئەوەی هەڵوێستێکی بابەتییانە لە بەرامبەریان وەربگرێت.

لە لایەکیترەوە، زۆربەی ئەو بابەتانەی کە ئەم دانراوانە لەبارەی ڕووداوە سیاسییەکانی کوردستان دەیانگێڕنەوە، دەخرێنە چوارچێوەی پێوەندییەکانی دەوڵەتی عوسمانی بە ئێرانەوە. یان بریتین لە پێوەندییەکانی قەوارە کوردییەکان بە دەوڵەتی عوسمانی و ئیالەتەکانییەوە، بەتایبەت هەردوو ئیالەتی بەغدا و موسڵ. ئیتر زۆربەی دانراوەکان زانیاریگەلێکی ئەوتۆمان لەبارەی رووداوە سیاسییە نێوخۆییەکانی کوردستان پێنادەن. ئەمە بێجگە لەدانراوەکانی (یاسین عومەری)، بەتایبەت هەردوو کتێبەکەی (غرائب الڵپر) و (الآپار الجلیە). چونکە مێژوونووسی ناوبراو لەم دوو کتێبەدا کۆمەڵێك زانیاری گرنگی تۆمارکردووە لەسەر ئەو ڕووداوانەی لە کوردستان قەوماون، بەبێ ئەوەی ئەم رووداوانە پێوەندییان بە دەسەڵاتداریێتی عوسمانییەوە هەبێت.

